# داستانەکانی پاکیزەیی

عەلی دەمیراڵ



داستانەکانی پاکیزەیی

نووسینی: عەلی دەمیراڵ

وەرگێڕانی: دەستەی وەرگێڕانی دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان

چاپی یەکەم: کانونی دووەم - ٢٠١٧

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان / هەرێمی کوردستان

ژمارەی سپاردنی (٥)ی ساڵی (٢٠١٧)ی پێدراوە

تیراژ: ٣٠٠٠



دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان

www.irfanpublishing.com

گوندی ئینگلیزی خانووی ژمارە ٩ / هەولێر

+964 (0) 750 713 80 00

# پێڕست

## بەشی یەکەم

## چەند تابلۆیەکی پاکیزەیی لە ڕابردوودا

پێرست

## بەشی دووەم

## تابلۆکانی پاکیزەیی
## لە ڕۆژگاری ئەمرۆماندا

پێرست

# پاکیزەیی چییە؟!

## پاکیزەیی واتە هەڵسوکەوتکردن لەنێو بازنەی شکۆداری و ڕەوشتدا.

پاکیزەیی بەواتاکانی بەدووربوون لە وتە و کرداری ناشرین و مانەوە لە بازنەی شکۆداری و ڕەوشت و ژیان لەنێو دروستی و سەرڕاستی و وابەستەیی بەبەها بەرزە ئەخلاقییەکان دێت.

کەسانی پایەبەرزی نێو ئێمە لەگەڵ ئەوەدا کە بە ویستەوە مامەڵەیان لەگەڵ ئارەزوو و چێژەکانی نێو بازنەی حەڵاڵ کردووە، بە ویستی خۆشیان لە هەموو ئەو ویست و ئارەزووانە دوورکەوتوونەتەوە کە دەبنە هۆی لادان لە بازنەی ڕێپێدراوەکان، ئەمەشیان بە وشەی "پاکیزەیی" پەسنکردووە. لەم ڕوانگەیەوە پاکیزەیی بریتییە لەوەی مرۆڤ مافی تەواوەتی ئیرادەی بدات و جڵەوی ئارەزووە جەستەیی و شەهەوییەکانی بکات و دوور بکەویتەوە لە ژیانێك کە تەنها لەسەر خولگەی چێژێکی دونیایی بونیادنرابێت و، بە واتای ڕازیبوون دێت بە چێژە دونیاییە ڕێپێدراوەکان.

پاکیزەیی تایبەتمەندییەکە پەروەردگار لە بنەڕەتەوە بەخشیویەتییە ئێمەی بەندەی. ئەمە یەکێکە لە گرنگترین ئەو تایبەتمەندییانەی کە مرۆڤ لە ئاژەڵ جودا دەکەنەوە. چونکە ئاژەڵەکان دارای خاسیەتەکانی وەك ڕەوشت و شەرم و شکۆ نین.

قورئانی پیرۆز ئەوە دەخاتە ڕوو کە باوەڕداران مرۆڤی پاك و بەشەرمن و پارێزەری داوێنیانن.[1]

لە پاداشتی ژیانێکی پاکیزەدا موژدەی لێخۆشبوونی خوا و ناز و نیعمەتەکانی ڕۆژی دوایی دەدات.[2] لەبەرگرنگی و بایەخی بابەتەکە بە جیاجیا ئاماژە بە ئافرەت و پیاو دەکرێت و، فەرمان بە هەموو باوەڕداران دەکرێت داوێنپاك بن و لە هەموو ئەو ڕێگایانە دووربکەونەوە کە وەك دەرگایەکی کراوەن بەڕووی حەرامدا.[3] جگە لەوەش خوای گەورە چیرۆکی ژیانی حەزرەتی یوسف و حەزرەتی مەریەم (عَلَيۡهِمُ السَّلَامُ) کە سەرمەشقی ڕەوشتبەرزین بە نموونە دەهێنێتەوە تا ئاسۆی شکۆداری و لەگوناه بەدووربوون بۆ باوەڕداران ڕوونتر بکاتەوە.

بەم جۆرە پاکیزەیی بەسەربردنی ژیانە لە بازنەی ڕێپێدراودا و دەستدرێژی نەکردن و هەنگاونەنانە بۆ مەیدانی ڕێپێنەدراو. دەبێت مرۆڤی خاوەن پاکیزەیی سەرجەم ئەندامانی جەستەی ڕابهێنێت لەسەر ئەوەی تەنها بەو چێژانە ڕازی ببێت کە دەکەونە نێو بازنەی حەڵاڵەوە و، نابێت بە هیچ شێوەیەك لە حەرامەوە

---

١. بڕوانە: سورەتی المؤمنون، ٢٣/٥-٧.

٢. بڕوانە: سورەتی الأحزاب، ٣٣/٣٥.

٣. بڕوانە: سورەتی النور، ٢٤/٣٠-٣١.

بگلێت و پێویستە لە هەموو ئەو کارانە دوور بکەوێتەوە کە زیان بە شکۆ و کەسایەتیی دەگەیەنن.[1]

مامۆستا بەدیعوزەمان سەعید نوورسی باسی سێ هەستی سەرەکی لە مرۆڤدا دەکات، ئەم هەستانەش بەم شێوازە پۆلێن دەکات (هێزی ژیری و، هێزی توڕەیی و، هێزی ئارەزوو(شەهوەت)).

هێزی ژیری بریتییە لە توانستی بینینی ڕاستییەکان و جیاکردنەوەی شتانی سوودبەخش و زیانبەخش لە یەکدی؛ هێزی توڕەیی بنکەی ئەو هێزەیە کە دەبێتە سەرچاوەی هەستەکانی وەك ڕق و توندوتیژی و توڕەیی و هەڵچوون لە مرۆڤدا؛ هێزی ئارەزوو(شەهوەت)یش ئەو هەستەیە کە دەبێتە سەرچاوە بۆ ئارەزوو و حەزە جەستەییەکان.

مامۆستا بەدیعوززەمان ئەو زیادەڕەوییەی بە داماڵرانی هێزی شەهەوی لە هەستی شەرم و حەیا دێتە کایەوە بە (فسق و فجور) ناو دەبات. بەڵێ، مرۆڤ لەو دۆخەدا وای لێ دێت بێباکانە هەموو تاوانێك ئەنجام بدات و، تەنانەت لە هەمبەر نیعمەت و چێژە حەڵاڵەکانیشدا بێهەست و بێجوڵە مامەڵە بکات.

پاکیزەیی بە پێناسەیەکی دیکە بەواتای ئەوە دێت مرۆڤ لە ڕوانگەی هێزی ئارەزووەوە لەسەر ڕاستەڕێ بمێنێتەوە و خوازیار بێت بۆ ئارەزووە ڕێپێدراوەکان و بەشێوەیەکی خۆویستانە لە ئارەزوو و حەزە ڕێپێنەدراوەکان دوور بکەوێتەوە.[2]

---

١. م. فەتحوڵڵا گولەن، بارانەکانی دەمەوعەسر.

٢. بەدیعوززەمان سەعید نوورسی، إشارات الإعجاز.

پاکیزەیی بە واتای ئەوەش دێت کە مرۆڤ بە چاو و دڵێکی تێرەوە تەماشای ئەو شتانە بکات کە بە دەست و لەنێوکاسەی کەسانی دیکەدان. قورئانی پیرۆز ئەو کەسانە بە نموونەی پاکیزەیی دەهێنێتەوە کە لە کاتی هەژاری و نەداریدا نەفسبەرزن و سەرەڕای پێویستییان ئەم دۆخەیان لە کەسانی تر دەشارنەوە و دەستیان لێ پان ناکەنەوە و دەفەرموێت:

﴿يَحْسَبُهُمُ ٱلْجَاهِلُ أَغْنِيَآءَ مِنَ ٱلتَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُم بِسِيمَٰهُمْ لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا ۗ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ﴾

(البقرة:٢٧٣)

"(ئەو جۆرە بەخشینانە پێشکەش بکەن) بەو هەژارانەی لەپێناوی خوادا لێبڕاون و ناتوانن بگەڕێن بە زەویدا و بازرگانی و کاسبی بکەن، ئەوەی نەیانناسێت، (ئەو هەژارانە ئەوەندە کەسایەتیی خۆیان ڕادەگرن و نەفسبەرزن)، وا دەزانێت دەوڵەمەندن، تۆ ئەی پێغەمبەر بە ڕەنگ و ڕوخسار و سیمایاندا دەیانناسیت، داوا ناکەن لە خەڵکی بەزۆر شتی لێ بسێنن و ڕووگیریان بکەن."

﴿وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ ۖ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾

(النساء: ٦)

"ئەوەی دەوڵەمەندە با دەستی بپارێزێت و ئەوەش کە هەژارە با لێی بخوات و لە سنوور دەرنەچێت و زیادەڕەوی نەکات"

لەم ئایەتە پیرۆزانەدا پاکیزەیی (عیففەت) بە مانای ئەوە خراوەتە ڕوو کە مرۆڤ لە کاتی پێویستیدا پێویستییەکەی لە جیاتی خەڵك بۆ جەنابی حەق دەربڕێت. سەرەتا پێغەمبەری ئازیزمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و دواتریش هاوەڵە

بەڕێزەكان (رضي الله عنهم) تەنانەت لە تەنگانەترین كاتەكانی ژیانیاندا داوایان لە خەڵكی نەكردووە و لەم بابەتەدا زۆر بەهەستیاری مامەڵەیان كردووە. بەڵام ئێمە لەم پەرتووكەدا بە واتای جڵەوكردنی ئارەزوو و حەزە جەستەییەكانی مرۆڤ لەسەر پاكیزەیی دەوەستینەوە.

دەبێت ئاماژە بەوەش بكەین كە گەرچی وشەی پاكیزەیی لە كلتووری ئێمەدا بە دەستەواژەیەكی ڕەوشتی دادەنرێت كە زیاتر پەیوەندیی بە ئافرەتانەوە هەبێت بەڵام بێگومان ئەمە ڕاست نییە. وەك چۆن دەبێت ئافرەت پاكیزەیە بێت بە هەمان شێوە دەبێت پیاویش پاكیزە بێت.

## وریابە! ئەگەری خلیسكان و كەوتن لە ئارادایە!

كاتێك تەماشای ژیانی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) دەكەین، دەبینین كاریگەریی ڕەوشتی جوان و بەرزی ئەو ئازیزە بەڕوونی لەسەر ژیانی هاوەڵانیش دەبینرێت. ئازیزمان كە زۆر هەستیار بووە لەمەڕ پاراستنی ئوممەتەكەی لە هەموو جۆرە گوناهێك، لە وەرزی حەجدا كە هەمووان بە ژن و پیاوەوە تەواو پابەندی پاكیزەیی بوون، لە كاتێكدا كە ئەركی حەجیان بەجێهێنابوو و لە عەرەفات دەگەڕانەوە، "فەزڵی كوڕی حەزرەتی عەبباس"یش لەگەڵ پێغەمبەرماندا و لەسەر وڵاخەكەی ئازیزمان بوو. ئازیزمان سەری فەزڵی بەرەو ڕاست و چەپ دەسووڕاند و یارمەتیی دەدا تا چاوی نەكەوێتە سەر ئافرەتانی ئەملا و ئەولای.[1]

دەبینین سەردەمەكە سەردەمی بەختەوەرییە، وەرزەكە وەرزی حەجە،

---

١. سنن أبي داود، المناسك ٢٥؛ الترمذي، الحج ٨٧.

وڵاخەکە هی پێغەمبەری خوایە و ئەو کەسەش کە سەری بۆ ڕاست و چەپ دەسووڕێنرێت تا بیپارێزێت لە نەزەر نەکردن، حەزرەتی فەزڵە کە کەس گومانی لە پاکیزەیی نییە، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەم ڕاستییانە هەستیاریی بابەتەکە وا دەخوازێت ئازیزمان خۆی جەخت لەسەر گرنگییەکەی بکاتەوە. تەنانەت لە دۆخێکدا کە گومان لە مەحاڵبوونی شتێکی وەهادا نییە، لەپێناوی ئەوەی خەیاڵی تر نەچێتە نیگایەوە و تیرێکی سەرکێش دڵی کون نەکات، سووڕاندنی سەری فەزڵ لەملا بۆ ئەولا، تابلۆیەکی پڕ عیبرەت دەربارەی هەستیاریی پێغەمبەری ئازیز بۆ ئەم بابەتە وێنا دەکات.

مامۆستا سەعید نوورسیش بەم شێوەیە سەرنجمان بۆ ئەم مەترسییە ڕادەکێشێت:

"پەروەردگار هێندە ئامێری مەعنەوی و لایەنی ناسکی بە چییەتی تۆ بەخشییەوە، بە جۆرێك هەندێکیان هەیە گەر هەموو دونیاش قووت بدەن تێر نابن؛ هەندێکیشیان ناتوانن تەنها گەردێکیش لە خۆیاندا جێگە بکەنەوە، وەك چۆن سەر دەتوانێت بەردێکی قورس هەڵبگرێت، بەڵام چاو ناتوانێت تاڵەموویەکیش لە خۆیدا جێبکاتەوە. ئەو لایەنە ناسکەش، بەرگەی قورساییەکی هێندەی ئەو مووە، واتە حاڵەتێکی بچووك کە سەرچاوەکەی بێئاگایی و گومڕایی بێت، ناگرێت. تەنانەت هەندێك جار دەپووکێتەوە و دەمرێت. مادەم بەم شێوەیە، خۆت بپارێزە، بەورياييەوە هەنگاو بنێ، لە نوقمبوون بترسە. لە پاروویەك، وشەیەك، دانەیەك، بریسکەیەك، ئاماژەیەك، یان ماچێکدا نووقم مەبە. ئەو لایەنە ناسکە گەورانەت کە توانای قووتدانی دونیایان هەیە لەودا نوقم مەکە!"[١]

---

١. بەدیعوززەمان سەعید نوورسی، بریسکەکان، بریسکەی حەڤدەهەم.

"وەكو چۆن تەماشاكردنی تەرم و لاشەی مردووی ئافرەتێكی جوان كە ئاتاجی سۆز و بەزەیە بە ڕوانینێكی ئارەزووبازانەوە، ڕەوشت دەڕوخێنێت. بە هەمان شێوەش سەیركردنی شێوەی ئافرەتانی مردوو یان وێنەی ئافرەتانی زیندوو كە لە حوكمی تەرمی بچووكدان بە شێوەیەكی ئارەزووبازانە، بەقووڵی هەستە بەرزە مرۆییەكان دەلەرزێنێت و وێرانیان دەكات."[1]

لەم دەربڕینانەوە بۆمان دەردەكەوێت ئەو بابەتانەی كە زیان بە پاكیزەیی دەگەیەنن وەك ڕوانینی حەرام، هێزی كاریگەریی ئیمان دەڕوخێنن و، دەبنە ڕێگر لەبەردەم سوودوەرگرتنێكی ڕاستەقینە لە ئیسلام و وا دەكەن بەشێك لە لایەنە ناسكەكانی ناخی مرۆڤ ئەدای ئەركی خۆیان نەكەن. حەزرەتی بەدیعوززەمان دەڵێت "بە وریاییەوە هەنگاو بنێ، وە گەر نا ئەگەری خلیسكان و كەوتن لە ئارادایە." بەمەش ئێمە بانگهێشت دەكات تا بەردەوام وریا و بەئاگا بین.

## مرۆڤی خاوەن پاكیزەیی هەستی ئارەزووی لە ڕێگای ڕێپێدراودا بەكار دەهێنێت.

پاكیزەیی بریتییە لەوەی مرۆڤ چ ژن بێت یان پیاو لەپێشدا ئاگاداری جەستەی خۆی بێت و، ئەو ڕاستییە بزانێت كە جەستە ئەمانەتێكە و لە لایەن خاوەنی ڕاستەقینەی خۆیەوە پێی بەخشراوە. ئەو كەسەی كە ئەم جەستەیەی دروستكردووە و خاوەنییەتی باشترین یاسادانەرە بۆی پاكیزەیی ئەو مرۆڤەی

---

١. بەدیعوززەمان سەعید نوورسی، وتەكان، وتەی بیست و پێنجەم.

خۆی ناکاتە خاوەنی ڕەهای جەستەی و خاوەنە ڕاستەقینەکەی دەناسێت، گوزارشت لەوە دەکات کە جەستەی بە ئاڕاستەی هەوا و ئارەزووەکانی خۆی و بیرۆکە تێپەڕ و ڕاگوزەرە کۆمەڵایەتییەکاندا بە هەدەر نادات، بەڵکو هەریەك لە ئەندامانی جەستەی و هەستەکانی بە ئاڕاستەی فەرمانەکانی پەروەردگاری بەدیهێنەریاندا بەکاردەهێنێت.

مرۆڤی پاکیزە هەستی ئارەزوو(شەهوەت)ی لە بازنەی ڕێپێدراو و ڕێگای حەڵاڵدا بەکاردەهێنێت و سەرجەم بەخششەکانی پەروەردگاری بە شێوازێکی گونجاو لەگەڵ ئامانجی بەدیهێنانیان سوود لێ وەردەگرێت. بۆ نموونە پاکیزەیی چاو بریتییە لەوەی نەبێتە ئامرازێك بەدەست شەهوەت و ئارەزووە جەستەییەکانەوە و، لە جوانییە حەڵاڵەکان بڕوانێت و، ببێتە دەرگای تێڕامان و بیرکدنەوە.

با کۆشکێك بهێنینە پێش چاوی خۆمان، ئەو کۆشکە ناوازەترین دەستکردی هونەری دونیا بێت... لەناویدا هەمووشتێك هەبێت. شتەکانی ناویشی با لە قەشەنگترین و ڕازاوەترین و بەنرخترین و هاوچەرخترین و گونجاوترین جۆر بن. ئەم کۆشکە بە شێوازێکی سەرسووڕهێنەر وردەکاریی کارەبایی و ڕووناککەرەوەی بۆ کراوە. کۆنترۆڵێکمان بە دەستەوەیە، هەر کە دەستمان لەسەر دوگمەی "هەڵبوون" داگرت چی لە خەیاڵماندا بێت دێتە بەردەستمان. کارەباکەشی بە هەمان شێوەیە، کاتێك دەست بە دوگمەکەدا دەنێین هەڵدەبێت. بەپێچەوانەوە ئەگەر دەستی پێدا نەنێین یاخود گەر دەست بە دوگمەی "کوژانەوە"دا بنێین خامۆش دەبێت.

بەڵێ، ئیرادەی مرۆڤ ئەم کۆنترۆڵەیە کە لە کۆشکی مەزنی دونیادا بە ئێمە بەخشراوە. گەر بڵێین "ئێمە لەم دونیایەدا هیچ ئیرادەیەك و هیچ

ئازادییەکی هەڵبژاردنمان نیە!" ئەوکات نکوڵی لەم نیعمەتە دەکەین و بەم جۆرەش خاوەنی کۆشکەکە تۆمەتبار دەکەین. بەڵام ئەگەر بڵێین "من پێویستم بە کۆنترۆڵ نییە، هەموو شتێك لە دەسەڵاتی خۆمدایە!" ئەو کاتە هەم بۆ ئێمە هەم بۆ کۆشکە ناوازەکەشتێکی جێی داخ دەبێت، چونکە لەم حاڵەدا نە جوانیی کۆشکەکە بەدەردەکەوێت، نە ئێمە دەتوانین ببینین. ڕێبەری ئەم کۆشکە (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرمووێت:

"یەکەم ڕوانین نابێتە گوناهـ، چاوەکانت دابخە یاخود ئاڕاستەیان بەرەو لایەکی تر بگۆڕە" هەروەها پێمان ڕادەگەیەنێت کە گەر بە شێوازێکی دروست کۆنترۆڵەکە بەکار بهێنین هەم لە کۆشکەکەدا ئاسوودە دەبین، هەم خاوەنی کۆشکەکە لە پاداشتی ئەم کارەدا کۆشکی گەلێ مەزن و ناوازەمان پێ دەبەخشێت. ئەم وتانەش لە ڕێگەی ڕستەکانی نێو کتێبی ڕێبەریی بەکارهێنەرانی ئەم کۆشکەوە پشتڕاست دەکاتەوە. بەڵێ، جگە لەوەش لەم کتێبە و کتێبەکانی یاریدەدەری ئەم کتێبەدا ئەوە خراوەتە ڕوو کە خاوەنی ئەم کۆشکە لە شادەمارمان نزیکترە لێمان و، ئەگەرچی لەناو ئەم کۆشك و تەلارانەدا جێگای نابێتەوە بەڵام لە دڵماندا جێگای دەبێتەوە و، گەر ئەو کۆنترۆڵە بەدروستی بەکار بهێنین دەبێتە ئەو چاوەی پێی دەبینین و دەستگیرۆییمان دەکات.

کەواتە لەبری ئەوەی بڵێیت "ناتوانم، پێم ناکرێت" یان "بێئیرادەم"، پێویستە بڵێیت "من خاوەنی ئیرادەم، تا ئەمڕۆ ئەم پەرتووکەم بەباشی نەخوێندووەتەوە و باش گوێم بۆ وتەکانی ڕێنیشاندەرەکەم نەگرتووە. لەمەودوا کۆنترۆڵەکەم بەباشی بەکار دەهێنم و دەبمە فەرماندەی نەفسم و، ئەم کۆشکە ناوازەیەش دەکەم بە هۆکار بۆ بەدەستهێنانی هەزارانی دیکە!"

لەمەودوا ئەو چاوانەی کە تا ئەمڕۆ ڕۆژانە سەدان جار بێنەوەی هەستی پێ بکەین تروکاندوومانن، هەندێك جار بە گوێرەی ویست و بەئاڕاستەی ئیرادەمان دەیتروکێنین، هەمووی هەر هێندەیە...

ئەوکات گەر پێڵوی چاوەکانمان بکەینە کۆنترۆڵێك بۆ دڵەکانمان دەتوانین بە بەرزبوونەوەیەکی ستوونی بگەین بەو گەوهەرانەی کە لە دامێنی عەرشەوە دەوەرن و بە وێنەی ئەستێرەکان دەکەینە پێپلە بۆ بەرزبوونەوەمان.

## وەك چۆن لاو مەیلی بۆ گوناهـ هەیە، گوناهیش مەیلی بۆ لاو هەیە!

بێگومان تافی لاوێتی ئەو قۆناغەیە کە تیایدا جڵەوکردنی نەفس لە هەموو قۆناغەکانی تر سەختتر و دژوارترە. لە گەنجێتیدا لەبری عەقڵ، هەست و سۆزەکان کاران. ئەو گەنجەی بە هەستەکانی هەڵسوکەوت دەکات زوو فریوی نەفس دەخوات و لەبەردەم لافاوی هەستەکانیدا بەرگە ناگرێت و نوقم دەبێت.

ئەو شتانەی ئایین مۆری "گوناهـ"ی لێداون، بە لای نەفسی لاوەوە زۆر سەرنجڕاکێشە. وەك چۆن هەندێك لە پەپولەکان خۆیان فڕێ دەدەنە نێو ئاگرەوە، گەنجیش مەیلی ئەوە دەکات خۆی فڕێ بداتە نێو ئاگری گوناهەوە.

سەرەڕای ئەو جیاوازییەی لەنێوان کەسەکاندا هەیە، سەختترین کات بۆ جڵەوکردنی نەفس تەمەنی نێوان ١٥ بۆ ٣٠ ساڵییە. هەموو گەنجێك لەم

تافەدا ڕووبەڕووی تاقیکردنەوەی شەهوەت و ئارەزوو دەبێتەوە و بە ڕەگەزی بەرامبەر تاقیدەکرێتەوە.

پاکیزەیی لەم قۆناغەدا واتە دوورکەوتنەوە لە گوناهەکان و سەرنەوی نەکردن بۆیان، کە گرنگییەکی بەرچاوی هەیە. چونکە وەك چۆن لاو مەیلی بۆ گوناه هەیە، گوناهیش مەیلی بۆ لاو هەیە. ئاخر مرۆڤێکی بەساڵاچوو گەر مەیلیشی هەبێت چیدی ناتوانێت هەندێك گوناه ئەنجام بدات.

بەم شێوەیە لە سەردەم و قۆناغێکی وەهادا کە نەفس بە ئارەزووی ئەنجامدانی گوناهەوە دەسوتێت، پێویستە لاو گوێ لە نەفسی نەگرێت و لە بری ئەوەی ڕادەستی هەوا و ئارەزووی بکات، بەرەو ڕێگای ڕاست و هیدایەت بیداتە بەر. ئەوانەی لەم کارەدا سەرکەوتوو دەبن، لە ژیانی دوای لاوێتییاندا بە شێوەیەکی ئاسانتر جڵەوی نەفسیان دەکەن و بە پاکیزەیی و ئیستیقامەتەوە تەمەنیان بەسەر دەبەن.

با بزانین لە کتێبی نووری نەرمدا چۆن ئەم بابەتە خراوەتە بەرباس:

"... لە دۆخێکدا کە شەهوەت هەموو جەستەی گرتووەتەوە و بەسەر منێتیدا زاڵە و ڕۆح دەهەژێنێت، تەنانەت لە کاتێکی وادا کە ئیرادە شل بووە و بە ڕووی هەموو خراپەیەکدا واڵابووە، زۆر گرنگە لەم دۆخەدا مرۆڤ لەبەر خاتری خوای پەروەردگار خۆی بوەستێنێت. دەکرێت ئەم هەڵوێستەیەی مرۆڤ ببێتە هۆکار بۆ بەرزبوونەوەی ستونی بەرەو لوتکە و بێگومان گەر مرۆڤ لە ئەنجامدانی کردەوەیەکی وادا سەرکەوتووبێت، دەچێتە ژێر چەتری کەفالەتی پێغەمبەری خواوە و بەرەو بەهەشت دەفڕێت.

بەڵێ، بەوپەڕی پێداگرییەوە دەڵێم؛ ئەوەی بتوانێت جڵەوی سەرکەشییەکانی نەفسی بکات و، لەو دەمانەدا کە بە ڕووی خراپەکاریدا والاَیە بیخاتە ژێر فەرمانی خۆیەوە و لە گوناهکردن بیکێشێتەوە و لە هەمبەر خراپەدا دان بە خۆیدا بگرێت و، بە جۆرێك بێت وەك ئەوەی بەردەوام لەبەرامبەر ئەم لاوازییانەدا لە سەنگەردا بێت، ئەوا دەتوانێت ئەو فیوضاتەی کە کەسێکی گۆشەنشین بۆ پەرستش بە چەندین ساڵ بە دەستی دەهێنێت ئەم لە ساتێکدا دەستی بکەوێت. هەر ئەم هەڵسوکەوتە دەتوانێت لە یەك ساتدا زیاتر لەو دەستکەوتە دەست خاوەنەکەی بخات کە کەسێکی تر لە ئەنجامی بەجێهێنانی هەزار ڕکات شەونوێژی هەموو شەوێکدا دەستی دەکەوێت. بەڵێ، دەستی دەخات و بە شێوازێکی ستونی دەیگەیەنێتە خاڵی ویلایەت."

...

پێم وایە هەر لەبەر ئەمەیە کە حەزرەتی موحەممەد موستەفاش (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بە کەماڵی لەتافەتەوە لە کۆمەڵەی ژیانەوەی دووەمینی ڕوانیوە، کە لەم ئاخر زەمانەدا و لەنێو ئەم هەزار و یەك فیتنەیەدا هەوڵ دەدەن خاوەندارێتی لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام بکەن و فەرمانەکانی لە ژیانیاندا جێبەجێ بکەن.

ئەمڕۆ چواردەور و ژینگەی نێو گوزەر و بازاڕەکان وەك گێژاوێك مرۆڤەکان پەلکێشی ناو خۆی دەکات و لەناو خۆیدا دەیانتوێنێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو مرۆڤانەی کە پارێزگاری لە بوونی خۆیان دەکەن و و دان بە خۆیاندا دەگرن و ئارامگرن، دەکرێت بە هاودەمی هاوەڵان هەژمار بکرێن. هاوەڵان هاوڕێیانی پێغەمبەری خوان و، ئەمانیش برای ئەو پێغەمبەرەن. چونکە ئەو لە سەردەمی

ژیانی خۆیدا تامەزرۆیی بۆ ئەم مرۆڤانە خستووەتە ڕوو کە پاش چەندین سەدە دێن و وەك براکانی خۆی پەسنی کردوون و سڵاوی بۆ ناردوون.[١]

## دەبێت چی بکەین تا بەپاکیزەیی بمێنینەوە و بتوانین جڵەوی نەفسی خۆمان بکەین؟

گەر لە مێژوو بڕوانین، دەبینین لەو کاتانەدا کە مرۆڤایەتی لە ڕەوشتە باڵاکان و شەرم و شکۆ دوورکەوتووەتەوە و، دووچاری ناپاکیزەیی و لە گێژاوی داوێنپیسیدا بووە، ڕووبەڕووی کۆمەڵێك نەهامەتی و بەڵای وەها بووەتەوە کە بوونەتە هۆکار بۆ کۆتاییهاتنی. ئەو مرۆڤەی لە شەرم و شکۆ دوور دەکەوێتەوە، مانای وایە لە بنەچە و بنەڕەتی خۆشی دوورکەوتووەتەوە.

لە زۆر ئایەتی قورئانی پیرۆزدا باس لە بەهیلاکچوونی ئەو کۆمەڵگایانە کراوە کە لە پاکیزەیی بەریبوون. نەتەوەکانی وەك عاد و سەمود و لوط بە هۆی ناپاکیزەییانەوە بە نێو قوڵاییەکانی مێژوودا ڕۆچوون.[٢] پاکیزەیی بە ملنەدان بۆ ئارەزووە ڕێپێنەدراوەکانی نەفس بەدەست دێت کە ئەمەش لە بنەڕەتدا ئەرکێکی ئەخلاقییە بۆ هەموو موسڵمانێك.

باشە، ئەو شتانە چین کە دەبێت لەپێناو پاراستنی پاکیزەیی و بەدەستهێنانی شەرم و شکۆدا ئاگاداریان بین؟ دەربارەی ئەم بابەتە لە پەرتووك و نوسینەکاندا چەند بنچینەیەکی زۆر گرنگ دەستنیشان کراوە، با لێرەدا یەك یەك ئەم دەستورە ڕەوشتییانە بخەینە ڕوو:

١. صحيح مسلم، الطهارة ٣٩؛ بڕوانە: نووری نەمر ١؛ م. فەتحوڵلا گولەن.

٢. بڕوانە: سورەتی العنكبوت، ئایەتی ٣.

## ١. نابێت بێزاری ببێتە مایەی ناپاکیزەیی

لەمرۆماندا بێزاری بەتایبەت لە لای گەنجەکان بە شێوازێکی بەربڵاو بابەتی باسە. هەندێك لە گەنجان هەوڵ دەدەن بێزارییەکانیان لە ڕێگەی چەند کردار و هەوڵێکەوە بڕەوێننەوە کە بەرەو ناپاکیزەیی دەیانداتە بەر.

سەرەتا با بێینە سەر بناغەی کێشەکە. بێزاری بە شێوازێکی گشتی لە ئەنجامی ناسوودەنەبوونی دڵ و، نەبەستنی پەیوەندی لەگەڵ خوا و پێغەمبەرەکەی و، نەبوونی هاوڕێ و، نەخوێندنەوە و تێنەفکرین و، نەبوونی سەرقاڵی و، ئەنجامنەدانی ئەرکی خزمەت و هۆکاری تری هاوشێوەی ئەمانەدا دێتەکایەوە. مانای وایە لەم جۆرە کەسانەدا ڕێگاکانی دزەکردنی شەیتان پێش هەمووشتێك ئامادەیە.

هەربۆیە پێویستە چارەسەری بێزارییەکانمان لە بناغەوەبکەین و هەوڵبدەین کاتەکانمان بەو شتانەوە پڕبکەینەوە کە ئامانجی سەرەکیی بوونمانن، تا پارێزراوبین لە خەم و بێزاری. پێویستە ڕەچاوی ئەوە بکەین گەر هیچ بابەتێك لەمەڕ کارێکی پێویست یان ئەرکێکی خزمەتکردنی ئیمان لە ئارادا نەبێت، نەچینە ئەو ناوەندانەی کە ئەگەری گوناهکردنیان تێدایە. ئیدی ئەو ناوەندانە چ بازاڕ و شوێنەگشتییەکان بێت، چ ناوەندە ئەلیکترۆنی و میدیاییەکان بێت یاخود هەر ناوەندێکی دیکە.

لەم کاتانەشدا پێویستە بە شێوازێکی ئامادە بچینە دەرەوە. پێویستە چۆن مرۆڤ بە کێڵگەیەکی میندا دەڕوات، چۆن ئامادە و پڕچەك لەو شوێنانەدا دەسووڕێتەوە کە دوژمنە سەرسەختەکانی لێیە، بە هەمان شێوە پێویستە ئامادە و پڕچەك بەگوڕی مەعنەوی بڕواتە نێو ئەو ناوەندانەوە. بەپێچەوانەوە گەر

بەتەنیا خۆی لەگەڵ هەستەكانیدا و بەبێ ئامادەكاری و بە بۆشاییەكی دەروونییەوە و بەبێ ئەوەی قەڵغان و فیشەكە مەعنەوییەكانی ئامادەكردبێت، بچێتە بەردەم تیرە ژەهراوییەكانی شەیتان، ئەوكات خراپەكان و دیمەنەكانی گوناهـ و هەموو جۆرە هەوایەكی فانی دەوراندەوری ڕۆحی دەدەن. جا گەر ئەم دۆخە چەند جارێكیش دووبارە ببێتەوە، ئیدی وای لێ دێت هەستەكانی دەمرن و بەرامبەر خراپە و گوناهەكان هیچ هەڵوێستێكی نامێنێت و وەك شتانی ئاسایی لێیان دەڕوانێت و ئەنجامیان دەدات و بەم حاڵە پەرێشانەوە بەو ناوەندانەدا گوزەر دەكات كە بێگومان ویستی شەیتانیش هەر ئەمەیە.

با پێش ئەوەی بڕۆینە نێو ئەو ناوەندانەوە گوڕوتینی میتافیزیكی بەدەستبهێنین. با پێش ئەوەی بڕۆینە نێو ناوەندە جێ مەترسیەكانەوە، شتانێك بخوێنینەوە، شتانێك تەماشا بكەین یاخود گوێ لێ بگرین كە دڵمان ببزوێنن و، خرۆشانی ناخمان پێ ببەخشن و، چاوانمان بهێننە فرمێسك و هەستەمەعنەوییەكانمان بهێننە جوڵە. پاشان بەو جۆرە بچینە نێو ئەو ناوەندانەوە. بەڵێ، پێویستە تەنها بە گوڕ و تیشكی لەم جۆرەوە بچینە نێو ئەو ناوەندانە تا بتوانین سیستەمێكی بەرگری پتەو لەبەردەم گوناهەكاندا دابنێین و كارە پێویستەكانمان بەتەواوی بەئەنجام بگەیەنین.

### ٢. پێویستە بتوانین لەمپەر لەبەردەم ویستەكانی نەفسماندا دابنێین

خوو و ویستەكانی نەفس، وەك كۆمەڵە ژەهرێكی كوشندە وەهان، چەند قورساییەكن كە مرۆڤ بەرەو خوار دەبەن. بە ڕامكردنی نەفسیش ڕۆح گەشە

دەکات و بەرز دەبێتەوە. واتە هەتا نەفس خواردنی پێ بدرێت ڕۆح بچووك و تەسك دەبێتەوە و قورسایی پەیدا دەکات و بەپێچەوانەشەوە. لە ئەنجامی ئەمەشدا دڵ و هەست و هەستە مەعنەوییەکان دووچاری لێڵبوون و سستی دەبنەوە.

پێغەمبەری ئازیزمان (صَلَّىٰ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ئاماژە بەوە دەکات کە شەیتان بەنێو دەمارەکانی مرۆڤدا دێت و دەچێت.[1] ڕێنوێنیشمان دەکات کە ئێمە ئەو شوێنانە تەسك بکەینەوە کە ئەوی تێدا دەسووڕێتەوە. واتە بە جڵەوکردنی هەستە دونیاییەکانی وەك خواردن و خەوتن و هاوشێوەکانیان و سنووردارکردنیان لە ئاستی پێویستدا، نەفسمان ڕام بکەین و جێگەی شەیتانی تێدا تەسك بکەینەوە. چونکە بۆ نموونە، کەسێك کە بەردەوام و بێ بیرکردنەوە دەخوات و دەخواتەوە و دەست لە خواردن ناپارێزێت، زۆر ئاسانتر دەکرێت جڵەوی نەفسی لەدەست بدات و بەرامبەر هەستی شەهوەتی بدۆڕێت و بکەوێتە نێو گومانەوە.

لەبەر ئەوە زۆر گرنگە لەگەڵ ڕەچاوکردنی مافی ئیرادەماندا، هاندەرەکانی نەفس کز بکەین. بەپێچەوانەوە نەفس بەبەردەوامی دەبێتە دەرگایەکی کراوە بە ڕووی شەیتاندا.

هەروەك شەیتان، نەفسیش هەرگیز چاوەڕێی دۆستایەتی لێ ناکرێت. یەکەمین هەنگاو بۆ نزیکبوونەوە لە پەروەردگاری مەزن بریتییە لەوەی بزانین کە نەفس دوژمنێکی گەورەیە و بەردەوام هانی خراپەکاریمان دەدات و پێویستە کە "گەورەترین جیهاد" لەبەرامبەریدا بەرپا بکەین و، لە هەمان کاتدا هەوڵ بدەین خۆمان لە شەیتان ڕزگار بکەین.

بەم شێوەیە دەتوانین لەم ڕێگایەوە لەمپەڕ لەبەردەم نەفسماندا دابنێین و،

[1] ۱. صحيح البخاري، الأحكام ٢١.

هەوڵ و تەقەلای پێویست بخەینە گەڕ بۆ پەروەردەکردنی.

## ٣. پێویستە ئەو پەرتووکانە بخوێنینەوە کە گوڕ و تینی مێتافیزیکیمان زیاد دەکەن

پێویستە هەموو ئیماندارێك ئەو بەرهەمانە بخوێنێتەوە کە پارێزگاری لە گوڕ و تینی مێتافیزیکیی مرۆڤ دەکەن و، لەبەرامبەر گوناهـ و کەشە گوناهاوییەکاندا دەیپارێزن و بەرامەی ئیمان و ئومێدیان لێوە پەخش دەبێتەوە. دەبێت ئەم خوێندنەوانەش بەڕێکوپێکی ئەنجام بدرێت. خۆ گەر ئەو کەسانەی کە هاوبەشی هەمان هەست و بیرن، بێن و بە شێوازی وانەی پێکەوەیی و دیراسەکردن ئەم خوێندنەوەیە ئەنجام بدەن، سوودەکەی زۆر زیاتریش دەبێت.

ئەوانەی بەم شێوەیە و بەردەوام دەخوێننەوە و خۆیان نوێ دەکەنەوە و، ئیمانیان پتەو دەکەن، دەتوانن لەبەرامبەر گوناهدا زۆر بەهێزتر بن.

نەشتەری کتێب و سوننەت کە لە دەستی ویژدانمان بەر نابن، سەرجەم برینە مەعنەوییەکانمان دەبڕن و فڕێیان دەدەن. بەرهەمی کەڵەپیاوانی مەعنا بە خۆیان و ئوسوڵی جۆراوجۆر و گونجاویی سەردەمییانەوە لەگەڵ ڕاستییە نەمردکانی نێو ئەم بەرهەمانەدا، گومانی تێدا نییە لە کورتترین ماوەدا برینە مەعنەوییەکانمان سارێژ دەکەن. هەر بۆیە پێویستە ئەم بەرهەمانە بەردەوام وەك مەرهەم و دەرمان لەبەردەستماندا بن.

پێویستە ئەم بەرهەمانە لەنێو پێوەر و پرەنسیپە ئاماژەپێدراوەکاندا بە ڕیزبەندییەکی زۆر باش پۆلێن بکرێن و بەبێ بێزاربوون و پێداگرانە بخوێنرێنەوە.

لەپێناو ئیستیقامەت و زیندوویی دڵ و هۆشماندا زۆر گرنگە موتالای

تابلۆکانی نێو ژیانی ئازیزمان و هاوەڵانی بەڕێزی و دواتریش پیاوچاکانی مەشخەڵبەدەست بکەین و بیانخوێنینەوە و گوێیان لێ بگرین و لەبەر ڕۆشنایی ئەواندا ڕەنگ و شەوق بە ژیانمان ببەخشین.

ئەو مرۆڤەی بتوانێت بەراوردی خۆی و ژیانی لەگەڵ ئەو نموونە مەزنانەدا بکات پێویستە تێ بفکرێت و بڵێت "ئەوان وەها بوون، ئەی ئێمە چۆنین؟" و، بەم شێوەیە لێپرسینەوە لەگەڵ خۆیدا بکات و هەوڵ بۆ باشترکردنی خۆی بدات.

## ٤. زۆر یادی مردن بکەین

سەرداری کائینات (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، داوامان لێ دەکات زۆر یادی مردن بکەین، ئەوەتا دەفەرموێت "زۆر یادی ئەو شتە بکەنەوە کە چێژ و خۆشییەکان تاڵ دەکات"[١] مرۆڤ وەك چۆن بڕوا بە ڕاستیی مردن دەکات، گەر لە هەست و هۆش و عەقڵیدا ئەوە بنەخشێنێت و بەسەر دونیایێ خەیاڵ و بیرکردنەوەیدا زاڵی بکات و بڕوای بوونی ژیانی گۆڕ و بەردەوامی ئەو ژیانە تا قیامەت لە دڵیدا بچەسپێنێت، ئەوکات ڕوانینی بۆ دونیا و دوارۆژ دەگۆڕێت و ئەمەش لە ڕەفتارەکانیدا ڕەنگ دەداتەوە.

بیرکردنەوە لە مردن، لەبەرامبەر ئەو ئولفەتگرتن و وەسوەسانەی کە لە دەمارە مەعنەوییەکانی مرۆڤدا دێنە ئاراوە، و لەدژی کاریگەری و زیانەکانی ڤایرۆسی گوناه و ئەو میکرۆبە هاوشێوانەش کە شەیتان دەیانڕازێنێتەوە وەك دژەتەنێك کاردەکات و کاریگەرییان ناهێڵێت.

"مادام دەمرم و لەپاش مردنیش دەخرێمە بەر لێپێچینەوە؛ ئەوکات شتێکی

---

١. سنن الترمذي، القيامة ٢٦.

بێمانایە خوو بدەمە چێژە بەئازارەكانی ئەم دونیایە و، گوناهـ و بێشەرمی ئەنجام بدەم! كە بازنەی حەلاڵ هەبێت بۆچی پەنا بۆ بازنەی حەرامەكان ببەم، بۆچی هەنگاو بۆ ناپاكیزەیی بنێم؟"، بەم بیرۆكەیەوە مردن لە لایەكەوە پەشیمانكەرەوەیەكی بەهێزە و لە لایەكی تریشەوە گوڕ و تینێكی نەفسووناوی بۆ كاری چاكە بە مرۆڤ دەبەخشێت.

بیركردنەوە لە مردن بە هەردوو دیوە ترسێنەر و تامەزرۆیی بزوێنەكەیەوە خەمی لێپرسینەوەی خوای پەروەردگارمان لەلا چالاك دەكات و لە گوناهـ دەمانگرێتەوە، لە لایەكی تریشەوە تامەزرۆییمان بۆ ژیانێكی هەمیشەیی تاو دەدات و بە ئومێدی گەڕانەوە بۆ نیشتیمانی ڕاستەقینە دڵمان دەبزوێنێت و دەمانژیێنێتەوە و، لەپاڵ دڵماندا كاریگەریی ئەرێنی لەسەر ڕەفتار و هەڵسوكەوتەكانیشمان دادەنێت.

## ٥. پێویستە هاوڕێی باش پەیدا بكەین

ئەو مرۆڤەی بەتەنها و دوور لە كۆمەڵ دەژی و پێ ناخاتە زەمینی جەماعەتەوە، وەك گەڵایەك و وەك موویەك وەهایە؛ گەر لەملاوە فووی لێ بكەیت دەچێت بۆ ئەولا و گەر لەولاشەوە فووی لێ بكەیت ئەملا دەگرێت. بۆیە دەبینین تەنانەت ئەو مرۆڤە بەهێز و خاوەن شكۆ و هەیبەتانەی سەدەی بەختەوەریش هەستیان بە پێویستیی بەكۆمەڵبوون و پێكەوەیی كردووە.

بەڵێ، گرنگترین پەناگە كە لەبەرامبەر تەڵە و بۆسەی جۆراوجۆری هێزە خراپكارەكان و هێرشە بەكۆمەڵەكانی ئەوان و فریوخواردنی دەستی شەیتان و نەفس و تۆفانەكانی گوناهدا لە خنكان بمانپارێزێت، بریتییە لە بەكۆمەڵبوون

و پێکەوەیی. بانگهێشتکردن بۆ کۆمەڵایەتی بوون و پێکەوەبوون لەگەڵ کەسانی باشدا لەنێو گرنگترین بابەتەکانی ئەم ڕۆژگارەماندایە.

خوای پەروەردگار مرۆڤی وەك بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی بەدیهێناوە. ئەو مرۆڤەی بەتەنها ژیان دەگوزەرێنێت هەم لەبەرامبەر ڕەشەباکانی لادانداا کە لە هەرچوار لاوە هێرش دەهێنن بێهێز و بێ پشتیوانە و، هەم ڕەنگە لە کەڵك و سوودەکانی وەك قەبووڵبوونی نزاکانیش بێبەش بێت. لە سەروو ئەمەشەوە ڕەنگە ببێتە ئامانجی تیرە ژەهراوییەکانی شەیتان.

ئەو مرۆڤەی بەتەنها ژیان بەسەر دەبات، ئەمڕۆ نا سبەی دەکەوێتە نێو داوی شەیتانەوە، ئەگەری هەیە دامەنی بکەوێتە دەست شەیتان و بەو جۆرە ببێتە نێچیری پەنجەی سووری ئەو. هەر بیرۆکەیەکی خراپ کە شەیتان فڕێی دەداتە بیر و خەیاڵەوە، لە خاکی تەنهایی و بێزاریدا وەك تۆوێك باڵا دەکات و گەورە دەبێت.

لە مرۆڤێکی تەنهادا کە تۆوی خراپە و گوناهـ بیر و دڵ و ڕۆحیان داگیرکردووە، ئەم تۆوانە زوو یان درەنگ ناخی ئەو کەسە بەگیر دەهێنێت و سەردەردەهێنێت و لق و پۆپ دەردەکات، ئەو کاتەش ئەستەمە میوەی گوناهـ دەرنەکات.

پێویستە مرۆڤ وەك هەڵهاتن لە مار و دووپشك لە تەنیاییش هەڵبێت، دەبێت هاوڕێی باش بۆ خۆی پەیدا بکات تا هانی خێری بدەن و هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکات.

## ٦. پێویستە هەفتانە بە بەردەوامی ڕۆژێکمان هەبێت بۆ وەرگرتنی خۆراكی مەعنەوی

"مرۆڤێکە کار بەو زانستە دەکات کە پێیەتی". بێگومان ئەم دەربڕینەتان بیستووە. ئەم دەربڕینە بۆ ئەو کەسانە بەکاردەهێنین کە زانستەکەیان دەهێننە نێو ژیانەوە و دەبنە نموونە بۆ چواردەوریان. گوێگرتن لە ئامۆژگاریی ئەم جۆرە کەسانە هۆکارێکی کاریگەرە بۆ پەرتەوازەبوونی ئولفەتمان و، نەرمبوونی دڵمان و، لەمپەردانان لەبەردەم وەسوەسەکانی شەیتاندا.

مرۆڤ وەك بوونەوەرێك بە تایبەتمەندییەکانی عەقڵ و لۆژیك و توانستی بڕیاردانیەوە، بە دڵی پڕجۆش و ویژدانی پڕهەژان و چاوانی ئەسرینناوییەوە، پارچەیەکە لە هەست و سۆز. بەم پێوەرە ئەو لە دونیای ناوەوەیدا ئاتاجی قووڵبوونەوەیە و، لە دونیای ڕۆحیدا ئاتاجی دەوڵەمەندی و، لە ژیانی تێفکرینیشیدا ئاتاجی فراوانبوونە.

مرۆڤ وەك چۆن ئاتاجی ئەوەیە چیا بەستەڵەکەکانی ناخی بتوێنێتەوە، ویست و ئارەزوویەکی قووڵیشی تێدایە بۆ ئەو کانییانەی کە شیری مەعنەوییان لێ هەڵدەقوڵێت و برسێتیی مەعنەوی دەشکێنن. قورئانی پیرۆز چەندین جار فەرمانی گەیاندن بە ئازیزمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دەفەرموێت و ئەو سەرورەرەی جیهانیش دەفەرموێت "ئایین ئامۆژگارییە."[1]

بۆمان دەردەکەوێت کە گوێگرتنی مرۆڤ لەو کەسانەی کە دڵان بەجۆش دەهێنن و نەرمی دەکەنەوە و، پیسیی هەستە ڕەشەکان دەماڵن و، شەوقمان بۆ جیهانی ئەبەدییەت بەگەڕ دەخەن و، بە بابەتە ئایینی و زانستییەکان دونیای

---

١. صحیح مسلم، الایمان ٩٥.

بیرمان ڕۆشن دەکەنەوە، دیسان وەك نان و ئاو پێویستییەکی گرنگە و وەك خۆراکی مەعنەوییە.

لەبەر ئەوە نابێت مرۆڤ بڵێت "خۆ من ئەمە دەزانم، ئیدی بۆ گوێی لێ بگرم!"؛ وەك چۆن بەبەردەوامی خواردن و خواردنەوە دووبارە دەکاتەوە و، نەك هەر لێیان بێزار نابێت بەڵکو بەردەوام پێویستیشی پێیانە، بە هەمان شێوە پێویستە لانی کەم هەفتەی ڕۆژێك گوێ لە وانە و ئامۆژگاری بگیرێت کە بە خۆراکی دڵ و ڕۆح دەژمێررێت و لەمەڕ پاراستنی مرۆڤیش لە شەڕی شەیتان و گوناهەکان ڕۆڵێکی بەرچاو دەبینێت.

## ٧. نابێت بەبەتاڵی بمێنینەوە و، پێویستە ئەرك و فەرمانبەری وەربگرین

مرۆڤ بەبێ سەرقاڵی ژیانێك دەژی کە والایە بە ڕووی ناپاکیزەییدا، بەم جۆرەش دەرفەت دەداتە شەیتان. لەبەر ئەم هۆکارە نابێت بەبەتاڵی بمێنینەوە و پێویستە هەردەم لەدووی ئەو سەرقاڵییانە بین کە لە هەڵکشان و گوڕوتینندا دەمانهێڵنەوە.

شەیتان زیاتر هێرش دەباتە سەر مرۆڤە تەمبەڵەکان و، ئەوانەی کە بێهوودە لەنێو تەمبەڵیدا دانیشتوون. ئەو یەخەی ئەوانەوە دەگرێت کە هیچ کارێك ئەنجام نادەن و، کاتەکانیان بە ڕاوی مێش و سووڕانەوەی بێهۆ و دانیشتنی چەند کاژێری نێو شوێنە پڕدووکەڵەکانەوە بە هەدەر دەدەن.

دیسان ئەو هەوڵ لەگەڵ ئەوانەدا دەدات کە لەپێناو خزمەتی ئایین و نیشتیمان و میللەتدا هیچ شتێك ئەنجام نادەن و، لەبەرامبەر خزمەتکردنی

ئایین و ئیماندا داخراون و، هەوڵ دەدات لە خشتەیان ببات. چونکە ئەمانە ئەو نێچیرانەن کە شەیتان بە دوایاندا وێڵە.

مادام شەیتان زیاتر سوود لە تەمبەڵی و نەبوونی سەرقاڵیی ئێمە وەردەگرێت، لە کاتی بەتاڵیماندا بیرۆکە و خەیاڵی نەشیاو فڕێ دەداتە ناخمانەوە و، خەیاڵمان کە سەرقاڵی شتی تر نییە لەپێناوی خۆیدا سەرقاڵ دەکات و وایان لێ دەکات بیر لە گوناهـ بکەنەوە و پەلکێشی نێو گوناهیان دەکات؛ لەبەر ئەوە دەبێت ئێمەش لە ڕێگەی سەرقاڵبوونمان بە کردەوەی چاك و خێر و، بە کردار و چالاکی و ئارەقڕشتن بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی ئەو شوێنانە پڕ بکەینەوە کە دەکرێت شەیتان دەستی تێ بخات تا نەتوانێت ئەوەی دەیەوێت لە ئێمەوە دەستی بکەوێت.

## ٨. پێویستە خۆمان لەو کەش و ژینگانە بەدوور بگرین کە هەستە شەهەوییەکان دەبزوێنن

بۆ ئەوەی لە ناپاکیزەییەوە نەگلێین، پێویستە خۆمان لە ژینگە وروژێنەرەکان و، ئەو ڕاگەیاندنانە بەدوور بگرین کە هانی بەدڕەوشتی دەدەن. پێویستە لە ئینتەرنێت و، ڕۆژنامە و گۆڤار و تیڤی و کافتریاکاندا خۆمان لەو ناوەڕۆك و ژینگانە بپارێزین کە بەرەو گوناهمان دەبەن.

خوای پەروەردگارمان ئیرادەیەکی بە ئێمە بەخشیوە. پێویستە ئەم ئیرادەیەمان لە ڕاستەڕێی خێردا بەکار بهێنین و، تا بتوانین لەو فەزایە دوور بکەوینەوە کە بانگهێشتی گوناهمان دەکات.

## ٩. دەبێت لەپاش هەر گوناهێك کردەوەیەکی چاکە ئەنجام بدرێت

ئەنجامدانی کردەوەیەکی چاکە لەپاش هەرگوناهێك ڕێنوێنی پێغەمبەری ئازیزمانە. سەروەری پێغەمبەران فەرموویەتی ”ئەو کەسەی لەپاش ئەنجامدانی گوناهێك تەوبە دەکات و کردەوەیەکی چاکە ئەنجام دەدات، لەو پیاوە دەچێت کە بەرگێکی تەسکی ئاسنینی پۆشیوە. گەر لەپاش گوناهـ کردەوەیەکی چاك ئەنجام بدات، یەکێك لە ئەڵقەکانی بەرگە ئاسنینەکە دەکرێتەوە. گەر کردەوەیەکی تری چاك بە ئەنجام بگەیەنێت ئەڵقەکەی تریشی دەکرێتەوە. لە کۆتایی ئەنجامدانی کردەوە چاکەکاندا دواجار بەرگە ئاسنینەکە دەکەوێتە سەر زەوی.“

لەبەر ئەوە پێویستە ئەو ئیماندارەی کە دەکەوێتە نێو گێژاوی ناپاکیزەییەوە، تا دەتوانێت کاری باش ئەنجام بدات و سەدەقە ببەخشێت و، سەرقاڵ ببێت بەو کارانەوە کە دەبنە مایەی خێر بۆ خۆی و برا موسڵمانەکانی.

## ١٠. پێویستە نزا بکەین و، داوا لەوانی دیش بکەین نزامان بۆ بکەن

نزا و پاڕانەوە و، خوێندنەوەی ئەوراد و ئەزکار لەڕوانگەی پەیوەندی لەگەڵ خوای پەروەردگار گرنگییەکی بەرچاوی هەیە. بەم شێوەیە مانای وایە ئەو ئیماندارەی نزا دەکات و، ئەوراد و ئەزکار دەخوێنێت پەنای بۆ پەروەردگاری بردووە. جەنابی حەق میهرەبانترینی میهرەبانەکانە. ئەو هەرگیز دەست نانێت بە ڕووی ئەوانەوە کە پەنای بۆ دەبەن و، لە زۆنگاوی گوناهدا جێیان ناهێڵێت. لە ڕاستیدا ئەم ئایەتەش گوزارشت لەو ڕاستیە دەکات و دەفەرموێت:

﴿ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ﴾ (الضحى: ٣)

"پەروەردگارت دەستبەرداری تۆ نەبووە و وازی لە تۆ نەهێناوە و خەشمی لێ نەگرتوویت."

لەبەر ئەوە پێویستە مرۆڤی ئیماندار لەڕێگەی نزاکانی نێو پەرتوکی کۆمەڵەی نزاکان و، ویرد و زیکرەکان و نزای جەوشەن و تەسبیحات و نزا جۆراوجۆرەکانی ترەوە ڕوو لە پەروەردگاری بکات و پەنا بۆ ئەو خوایە ببات کە میهرەبانە و بەخشەرە لە گوناهەکان. بە هەمان شێوە دەتوانین داوا لە دایک و باوکمان و هاوڕێیان و کەسانی دەم بە نزا بکەین تا نزامان بۆ بکەن.

بۆ ئامادەکردنی ئەم بەشە سوود لە کتێبی " لە سێبەری باوەڕدا"
وەرگیراوە لە نووسینی م.فەتحوڵڵا گولەن.

# حەزرەتی یوسف وەک نموونەیەکی بەرزی پاکیزەیی

حەزرەتی یوسف (عَلَيْهِ السَّلَامُ) لە تەمەنی منداڵیدا لە لایەن براکانییەوە فڕێدرایە ناو بیرەوە و دواتریش وەك کۆیلەیەك فرۆشرا. وەزیرێك لە میسر ئەوی کڕییەوە، دواتریش خۆی و خێزانی وەك منداڵی خۆیان لە ئامێزیان گرت و سۆزیان پێدا. بەڵام کاتێك حەزرەتی یوسف تەمەنی منداڵی تێپەڕاند و پێی نایە چاخی لاوییەوە، زولەیخای خێزانی وەزیر ئارەزوویەکی خراپی لەبەرامبەر حەزرەتی یوسفدا بۆ دروستبوو.

ئەوەبوو ڕۆژێکیان هەموو دەرگاکانی ماڵەکەی لەسەر داخست و پاش خۆڕازاندنەوە چووە بەرامبەر حەزرەتی یوسف و وتی:

"دەی، لێم نزیك بەرەوە!"

حەزرەتی یوسفیش وەك تابلۆیەکی پاکیزەیی بەبێ هیچ دوودڵییەك فەرمووی:

"پەنا بە خوا!، من لە پەروەردگارم دەترسم!"

حەزرەتی یوسف (عَلَيۡهِ السَّلَامُ) بەم هەڵوێستەی بوو بە نموونەیەکی ئیرادەبەرزی و خۆڕاگری بۆ هەموو ئەو گەنجانەی کە لەدوای خۆیەوە دەهاتن!

لەبەر ئەوەی حەزرەتی یوسف لەخواترس و دڵ پڕ لە خشوع بوو، گوناهـ و تاوانی ڕەتکردەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی زولەیخا هێشتا لە بارودۆخێکدا نەبوو لەمە تێبگات، حەزرەتی یوسف بە شێوازێك درێژەی بە قسەکانی دا تا ئەو تێ بگات و وتی:

"هاوسەرەکەت گەورەی منە و لە منداڵییەوە زۆر بەباشی بەخێوی کردووم و هەڵسوکەوتی جوانی لەگەڵدا کردووم. جا ناپاك و ستەمکاران ڕزگاریان نابێت."

هەر لە ڕاستیدا وەزیر چاکەی زۆری لەگەڵدا کردبوو. ئەستەم بوو حەزرەتی یوسف بیر لەوە بکاتەوە ناپاکی بەرامبەر ئەنجام بدات. لەبەر ئەوە بە شێوازێك ئافرەتەکە تێی بگات ئاگاداری کردەوە و ئەوەی بیرخستەوە کە داواکارییەکەی نادروستە.

## با گوێ لە قورئان بگرین

قورئان بەم شێوازە ئەم ڕووداوەمان بۆ باس دەکات:

﴿ وَٱسۡتَبَقَا ٱلۡبَابَ وَقَدَّتۡ قَمِيصَهُۥ مِن دُبُرٖ وَأَلۡفَيَا سَيِّدَهَا لَدَا ٱلۡبَابِۚ قَالَتۡ مَا جَزَآءُ مَنۡ أَرَادَ بِأَهۡلِكَ سُوٓءًا إِلَّآ أَن يُسۡجَنَ أَوۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ (٢٥) قَالَ هِيَ رَٰوَدَتۡنِي عَن نَّفۡسِيۚ وَشَهِدَ شَاهِدٞ مِّنۡ أَهۡلِهَآ إِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن قُبُلٖ فَصَدَقَتۡ وَهُوَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ (٢٦) وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٖ

فَكَذَبَتْ وَهُوَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿٢٧﴾ فَلَمَّا رَءَا قَمِيصَهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٍ قَالَ إِنَّهُۥ مِن كَيْدِكُنَّ إِنَّ كَيْدَكُنَّ عَظِيمٌ ﴿٢٨﴾ يُوسُفُ أَعْرِضْ عَنْ هَـٰذَا وَٱسْتَغْفِرِى لِذَنۢبِكِ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ ٱلْخَاطِـِٔينَ ﴾

(یوسف: ٢٥-٢٩)

"لە كاتێكدا كە هەردووكیان بەرەو دەرگاكە ڕایان دەكرد. ژنەكە كراسەكەی یوسفی لەدواوە دڕی. (هەر لەم ساتەدا) لەبەر دەرگاكەدا ڕووبەڕووی هاوسەری ژنەكە بوونەوە.

ژنەكە یەكسەر وتی "ئاخۆ دەبێت سزای ئەو كەسەی كە بە مەبەستێكی خراپ لە خێزانەكەی تۆ نزیك بێتەوە جگە لە فڕێدانە ناو زیندان یان ئەشكەنجەیەكی زۆر بەئازار چی بێت؟"

یوسف وتی "لە ڕاستیدا ئەو ویستی كەوا دەستدرێژی بكاتە سەرمن و دەستم بەسەردا بگرێت." وە یەكێك لە خزمەكانی خاتوونەكەش گەواهی و شایەتی دا و وتی "ئەگەر كراسەكە لەپێشەوە دڕابێت ئەوە ژنەكە ڕاست دەكات و گەنجەكەش درۆ دەكات. یان نەخێر، ئەگەر هاتوو كراسەكە لە دواوە دڕابێت ئەوا ئەو درۆ دەكات و گەنجەكە ڕاستی دەڵێت." كە دەبینێت كراسەكە لە دواوە دڕاوە (پیاوەكە، بە هاوسەرەكەی) دەڵێت "ڕوونبوویەوە كەوا ئەمە یەكێكە لە یارییەكانی ئێوەی ژنان! بەڕاستی فێڵ و داوی ئێوە زۆر ترسناكە. یوسف! نەكەیت ئەمە لەلای هیچ كەسێك باس بكەیت! ئافرەت! تۆش بە هۆی ئەو گوناهەی كەوا ئەنجامت داوە داوای لێخۆشبوون بكە، چونكە تۆ چوویتە ڕیزی گوناهبارانەوە."

## قسە و قسەلۆکەکان لەبن نەدەهاتن

وەزیر هەولیدا بە پشتگوێخستنی ڕووداوەکە پەردەپۆشی بکات. مانەوەی ڕووداوێکی وەها لەنێو چینی باڵا و خانەدانانی میسردا بە شاراوەیی شتێکی ئەستەم بوو. ئاخر لەو سەردەمەدا داوێنپیسی زۆر بڵاوبووبووەوە و بە جۆرێك وەك هەڵسوکەوتێکی ئاسایی لێهاتبوو.

پاش ماوەیەکی کەم ئەم ڕووداوە لەنێو چینی باڵا و خانەداناندا بڵاوبووەوە. ئەوەی کە ژنە خانەدانەکان بە لایانەوە نامۆ و ناناسایی بوو گیرۆدەیی ئافرەتێك نەبوو بۆ پیاوێك، بەڵکو هۆگربوون و عاشقبوونی هاوسەری وەزیر بوو بە کۆیلەکەی و ڕێکخستنی پیلانێك بۆ بەدەستهێنانی شتێکی سەیر و نامۆ بوو لە لایان.

باسوخواسی زولەیخا تەواو کەوتبووە سەر زاری هاوڕێکانی. بە جۆرێك قسە و قسەلۆکەکان لە بن نەدەهاتن. بە ڕای ئەو ڕێگایەك هەبوو بۆ چارەسەرکردنی ئەم دۆخە: ئەویش بانگهێشتکردنی گەورە ژنانی خانەدان بوو بۆ خوانێك. پاشان بانگهێشتی کردن و کەشێکی لەباری ڕەخساند تا هەمووان تیایدا بخۆن و بخۆنەوە و ڕابوێرن. زۆر بەجوانی سەر مێزەکانی بە میوە و خواردنی جۆراوجۆر ڕازاندەوە.

ڕۆژی بانگهێشتەکە ژنە دەوڵەمەندەکان بە تامەزرۆییەوە ئامادەی بانگهێشتەکە بوون. زولەیخا فەرمانیدا بوو جۆرەها میوە لەسەر مێزەکان دابنرێت لەگەڵ چەقۆدا بۆ پاککردنیان. کاتێك هەمووان دەستیان کرد بە پاککردنی میوەکانیان حەزرەتی یوسفی بانگکردە هۆڵی میوانییەکە.

کاتێك ژنەکان حەزرەتی یوسفیان بینی لەبەرامبەر جوانییەکەیدا سڕبوون.

میوە و چەقۆكانی ناو دەستیان لەبیركرد. بە جۆرێك زۆربەیان بێناگایانە لەبری میوەكە دەستەكانی خۆیانیان بڕی. هەموو بە یەك زار وتیان ''یوسف مرۆڤ نییە بەڵكو ئەو فریشتەیەكە بۆ خۆی.''

زولەیخا بەمە زۆر كەیفخۆش بوو. چونكە بەڕای خۆی سەلماندبووی لە گیرۆدەیی حەزرەتی یوسفدا چەندە لەسەر حەق بووە.

هەر یەك لەم ڕووداوانە تاقیكردنەوە بوون بۆ حەزرەتی یوسف. ئەو بە سەختترین تاقیكردنەوەدا ڕەتبوو كە دەكرێت ڕووبەڕووی گەنجێك ببێتەوە، بەڵام بە هیچ شێوەیەك دەستبەرداری هەڵوێست و داوێنپاكییەكەی نەبوو. حەزرەتی یوسف ئامادەبوو لەبری ئەوەی دووچاری گوناهـ ببێت ڕووبەڕووی هەموو كێشە و نارەحەتییەكی دونیا ببێتەوە. بەم ئاكارەشی بووە سەرمەشق بۆ هەموو ئەو گەنجە ئیماندارانەی لەدوای خۆیەوە هاتن و دێن.

# هەڵوێستی حەزرەتی مەریەم لەبەرامبەر ئەو بوختانانەدا کە بۆیان هەڵبەست

حەزرەتی مەریەم لە کەشێکی پاك و بێگەرددا، بە عیففەت و شکۆوە پەروەردەکراوە. ڕۆژێك خوای پەروەردگار حەزرەتی جوبرەئیل لەسەر شێوەی گەنجێکی جواندا دەنێرێت بۆ لای.

لەبەر ئەوەی حەزرەتی مەریەم ئەو بە مرۆڤ دەزانێت لە ترسی ئەوەی زیانێکی پێ بگەیەنیت، دەشڵەژێت و نازانێت چی بکات. لەم ساتەدا هیچ کەسێك لەو دەوروبەرەدا نییە تا هانای بۆ بەرێت و داوای کۆمەك و یارمەتیی لێ بکات. هەر بۆیە بێجگە لە خوا کەسی تری نابێت هانای بۆ ببات و دەڵێت:

﴿ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيّٗا ﴾ (مریم: ١٨)

"پەنا بە خوای بەخشندە دەگرم لەبەرامبەر تۆدا. ئەگەر تۆ کەسێکی لەخواترسیت و لە حەرام خۆت دەپارێزیت دوور بکەوەرەوە لەسەر ڕێگەکەم!"

حەزرەتی جوبرەئیل بۆ ڕەواندنەوەی ئەم ترسەی ئەو و باسکردنی هۆکاری هاتنەکەی پێی فەرموو:

﴿إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَٰمًا زَكِيًّا﴾

(مریم: ١٩)

"من نێردراوێکم لە لایەن پەروەردگارتەوە. هاتووم تا منداڵێکی کوڕی پاکوخاوێنت بە دیاری پێ بدەم."

حەزرەتی مەریەم لەبەرامبەردا فەرمووی:

﴿أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا﴾

(مریم: ٢٠)

"چۆن منداڵم دەبێت لەکاتێکدا تا ئێستا دەستی هیچ پیاوێکم بەرنەکەوتووە و داوێنپیسیش نەبووم."

حەزرەتی جوبرەئیل فەرمووی:

﴿كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَلِنَجْعَلَهُۥٓ ءَايَةً لِّلنَّاسِ وَرَحْمَةً مِّنَّا وَكَانَ أَمْرًا مَّقْضِيًّا﴾ (مریم: ٢٠)

ئەو قسانەی تۆ ڕاست و دروستن، بەڵام ئەوە بڕیاری پەروەردگارە و دەفەرموێت: ئەوکارە لای من ئاسانە (کە بەبێ باوك ئەو منداڵە بهێنمە بوون)، بۆ ئەوەی بیکەمە نیشانە و موعجیزەیەك بۆ خەڵکی، هەروەها ڕەحمەتێکی تایبەتیش بێت لەلایەن ئێمەوە. ئیتر ئەو کارەش بڕیاری لەسەر دراوە و بڕاوەتەوە.

چەند مانگێك تێ دەپەڕن. مەریەم بە کچێکی داوێنپاك ناسرابوو کە خۆی بۆ میحرابی پەروەدرگار تەرخانکردبوو، لە ماوەی ڕوودانی ئەم ڕووداوانەدا

لە گۆشەگیریدا بوو. پاش تێپەڕبوونی چەند مانگێك و نزیکبوونەوەی کاتی منداڵبوون، حەزرەتی مریەم تەنها و بێکەس بە خۆگرتن بە قەدی دارخورمایەکەوە هەوڵی دەدا ڕووبەڕووی ئازار و ژانە سەختەکانی منداڵبوون ببێتەوە.

وەك کچێکی گەنج لەنێو سەرسامیی یەکەم جاری ئاشنابوون بە ئەم جۆرە ژانەدا دەتلایەوە. لەگەڵ ئەوەدا کە هیچ ئەزموونێکی لەمەڕ ئەو دۆخە نەبوو کە ڕووبەڕووی بووبووەوە، کەسیشی لە لاوە نەبوو تا بچووکترین کۆمەکی بکات. لەگەڵ ئەم ژانە جەستەییانەدا لە چنگی ئازاری دەروونیشدا کزۆڵە و خەمبار بووبوو.

## ئەی لەخواترس نەبوو، ئەی دیندار نەبوو!

ئەو بەنائومێدیی ئەو ڕووداوانەوە کە بەسەریدا هاتبوون، لەو گۆشەی تەنهاییەدا دووچاری تیری خەمی ناموس و ئەخلاق و شکۆ بووبووەوە کە ویژدانیان دەهەژاند. گەر وتبای "ئەوەی خوا بیەوێت دەبێت" و خۆی ئاسوودە بکردایە ئەی لەبەردەم شەرمەزاریی نێو کۆمەڵگا و بوونە بابەتی شەرمەزاری بە کچی بوونە دایك و ڕووبەڕووبوونەوەی چواردەوریدا چی دەوت؟

نوێنەرانی ئەو سەردەمەی خراپەکاری بەردەوام چاوەڕوانی هەلێك بوون تا کەسانی پاکداوێن و باوەڕداری پێ لەکەدار بکەن و بێگومان هەر ئەمەیان ببینیایە بە هاتوهاوارەوە دەیانوت "سەیری ئەم خاتوونە گەنجە بکەن کە گوایە خۆی بۆ خزمەتی خوا تەرخانکردووە، تەماشای ئەم ئافرەتە بکەن کە هەر بەکۆرپەیی ڕادەستی "بیت المقدس" کراوە! مانای وایە هەمووی درۆ بوو؛

ئەی لەخواترس نەبوو، ئەی دیندار نەبوو؟ ئەی ئەم منداڵە چییە و لە کوێوە پەیدابووە!“ ئەمەیان دەوت و هەرایان دەنایەوە.

حەزرەتی مەریەم دەترسا بە هۆی خۆیەوە قسە و قسەڵۆك بۆ ئایینەکەی و پاکیزەییەکەی و باوەڕداران دروست بکرێت. هەربۆیە بەدەم نرکە و ناڵەوە ئەم ڕستەیەی دەفەرموو:

﴿ يَٰلَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا ﴾

(مريم: ٢٣)

"ئای خۆزگە پێش ئەم ڕووداوە بمردمایە و بوومایەتە شتێکی لەبیرچووەوەی باسنەکراو"

بەڵێ حەزرەتی مەریەمیش بە ئەندێشەی تۆمەتبارکردنی بە ناپاکیزەیی و قسەوتن بە ئایینەکەی و پێدانی بەهانە بەدەستی بێباوەڕانەوە دەیوت ”خۆزگە!“

ئاواتی ئەو وەهمێکی دونیایی و پووچ نەبوو. ئەو بە لەبەرچاوگرتنی عیززەتی ئایین و گرنگیدانی بە پاکداوێنی و بێگەردیی خۆی و خەمخۆری بۆ داهاتووی کوڕەکەی -لەمەڕ ئەو بانگەوازە پیرۆزەی کە فریشتەکان هەواڵیان لێ دابوو- لە ناخەوە دەیوت ”خۆزگە لەوەو پێش بمردمایە و لەیاد بچومایەتەوە.“

## منداڵێکی ناو بێشکە قسە دەکات

حەزرەتی مەریەم لە بیابانێکی وشکدا و بەتەنها دەستی کرد بە بیرکردنەوە لەو خاوەنتوانایەی کە هێنایە نێو سەوزایی دەورەدراو بە دارخورماوە و دەرفەتی بۆ ڕەخساند تا بە دڵێکی پڕ لە ئاسوودەییەوە بحەوێتەوە. مزگێنییەکان بەردەوام دەبن:

﴿ فَكُلِي وَٱشۡرَبِي وَقَرِّي عَيۡنٗاۖ فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ ٱلۡبَشَرِ أَحَدٗا فَقُولِيٓ إِنِّي نَذَرۡتُ لِلرَّحۡمَٰنِ صَوۡمٗا فَلَنۡ أُكَلِّمَ ٱلۡيَوۡمَ إِنسِيّٗا ﴾

(مریم: ٢٦)

"بخۆ. بخۆرەوە. چاو و دڵت ڕۆشن. جا ئەگەر هەرکەسێکت بینی (پرسیاری منداڵەکەی لێکردیت) بە ئاماژە پێی بڵێ بەڕاستی من قسەنەکردنم لەسەر خۆم نەزرکردووە بۆ (خوا)ی میهرەبان لەبەر ئەوە ئەمڕۆ قسە لەگەڵ هیچ کەسێکدا ناکەم"

ئەم دەربڕینانەی نێو ئایەتە پیرۆزەکان ناز دەدەنە هەستەکان و دونیای ناوەوەی ئافرەتێك کە لە ڕووی ڕۆحییەوە خەمبارە و لە ڕووی جەستەییشەوە زامداری منداڵبوونە و بە شێوازێك لەگەڵیدا دەدوێن ئارامی و ئاسوودەیی پێ دەبەخشن. دواجار حەزرەتی عیسا (عَلَيۡهِ السَّلَامُ) لەدایك دەبێت و حەزرەتی مەریەم لە ئامێزی دەگرێت و دەگەڕێتەوە ناو گەلەکەی.

دواجار ئەم منداڵە ساوایە وەڵامی هەموو ئەو تۆمەتە نابەجێ و بێبنەمایانە دەداتەوە کە گەلەکەی بۆ دایکی هەڵدەبەستن و لە ئەنجامی ئەم وەڵامانەدا دڵی حەزرەتی مەریەم و مرۆڤە خاوەنهەستەکانی ئەوێ پڕ دەبێت لە ئاسوودەیی و کامەرانیی ئیمان.

# خوا، کیفلی بەخشی

سەردەمانێکی زوو پیاوێك هەبوو ناوی "کیفل" بوو. کیفل کەسێکی زۆر دەوڵەمەند بوو کە گوێی بە بەها ئەخلاقی و مرۆییەکان نەدەدا و، لەپێناوی پارەپەیداکردندا هەموو ڕێگایەکی بە شیاو و ڕێپێدراو دەزانی. سامانە بێشومارەکەشی لەڕێگای ڕیبا و سوودەوە پێکەوەنابوو.

ئەوانەی پێویستی و گرفتی داراییان دەبوو دەهاتن بۆ لای و داوای قەرزیان لێ دەکرد، ئەویش بە مەرجی سوودێکی زۆرەوە پارەکەی پێ دەدان. ئەگەر وادەی دانەوەی قەرزەکە بهاتایە و کابرا پارەکەی نەهێنایەتەوە، ئەوکات سوودەکەی زیاتر دەبوو. گەر نەیتوانیبایە قەرزەکە بداتەوە ئیدی کیفل لە ڕێی پیاوەکانییەوە دەستی بەسەر هەموو ماڵ و سامانی ئەو کەسەدا دەگرت.

ڕۆژێك ژنێك هاتە بەر دەرگاکەی و داوای قەرزی لێکرد. ئەم ژنە دایکێك بوو کە هێندە نەبوو مێردەکەی لەدەستدابوو و کەسێکی بەڕەوشت و داوێنپاك بوو و خۆی بۆ منداڵەکانی تەرخانکردبوو. هەوڵی دابوو بۆ ماوەیەك بەو میراتییەی کە لە مێردەکەیەوە بۆی مابووەوە ماڵەکەی بەڕێوەبەرێت. بەڵام

ئیدی هیچی بەدەستەوە نەمابوو. لەبەر ئەوە پێویستبوو کار بکات. ویستی کارێك بدۆزێتەوە بەڵام کەشی دەرەوە بۆ کارکردنی بێوەژنێك لەبار نەبوو. خەمی ئەوەی لە دڵدا بوو چواردەورەکەی بێزاری بکەن.

ئەوە بوو لە کۆتاییدا بیرۆکەیەکی باشی بە مێشکدا هات، بڕیاری دا کاڵا بچنێت و لە ڕێگای یەکێك لە خزمە نزیکەکانییەوە بیانفرۆشێت. بۆ ئەمە تەنها ئامێرێکی چنینی پێویست دەبوو. بە مەبستی کڕینی ئەم ئامێرە کەوتە گەڕان بە دوای قەرزدا. داوای لە دۆست و خزمە نزیکەکانی کرد، بەڵام کەسیان پارەیان نەبوو.

کاتێك بەناچاری بەرەو ماڵ دەڕۆشتەوە لە ڕێگادا گوێی لە دوو کەس بوو باسی کەسێکیان دەکرد بە ناوی کیفل کە بەقەرز پارەی دەدا بە خەڵکی. ئەمیس بڕیاری دا بچێت بۆ لای.

## خوایە یارمەتیم بدە!

کیفل هەر چاوی بە ژنەکە کەوت چووە دڵییەوە. بڕیاریدا بە دەستی بهێنێت. ئافرەتەکە داوای قەرزی کرد و وتی کە لە کاتی خۆیدا دمیداتەوە. کیفل هەر کە زانی ئافرەتەکە بێوەژنە، پێشنیارێکی بێڕەوشتانەی بۆ کرد. ئەوە بوو وتی ئەگەر ڕازی ببێت لەگەڵیدا بێت پێویست ناکات پارەکەی بۆ بگەڕێنێتەوە. ژنەکە پێشنیارەکەی بەتوندی ڕەتکردەوە. زۆر خەمباربوو. ترسی گەورەی ئەو ڕووبەڕووبوونەوەی پێشنیارێکی وەها بوو، بۆیە دەستەکانی بە ڕووی پەروەردگاردا کردەوە و وتی "خوایە یارمەتیم بدە!" پاشان ئەویی بەجێهێشت.

چەند ڕۆژێکی تر تێپەڕین. ئەوەی پێی بڵێیت خواردن لە ماڵەکەیدا

نەمابوو. منداڵەكانى لە برساندا گرمۆڵەبووبوون و بەبەردەوامى دەگريان. گريەى ئەوان دڵى دايكيانى شەقار دەكرد. بێچارە مابووەوە. بەجۆرێك هەستى كرد ناچارە خۆى ڕادەستى كيفل بكات. بەم حاڵەوە دەپاڕايەوە و دەيوت "خوايە گيان لێم خۆش ببە، بەڵێن دەدەم جارێكى ديكە گوناهى لەم جۆرە ئەنجام نەدەم!"

ژنەى بێدەرەتان چوو بۆ لاى كيفل. ڕوخسارى كيفل خەندەى لێ دەبارى. بەڵام ژنەكە لە لايەك دەگريا و لە لايەكيش دەلەرزى. كيفل لە هۆكارى ئەم بارودۆخەى ژنەكەى پرسى. ژنەكەش وتى:

"بە خواستى خۆم نەهاتووم بۆ ئێرە. هەرگيز تا ئێستا گوناهێكى لەم جۆرەم ئەنجام نەداوە. هەژاريم ڕاپێچى ئەم گوناهەم دەكات. لەبەر ئەوە زۆر شەرم لە خوا دەكەم و لێى دەترسم."

## دەبێت من لە تۆ زياتر شەرم لە خوا بكەم و لێى بترسم!

كيفل بەوەى بيستى زۆر سەرسامبوو. ئەو دڵە توندەى لە ساتێكدا نەرمبووەوە. هەستێكى قووڵى پەشيمانى باڵى بەسەر ناخيدا كێشا. لەو كاتەدا ئەم وتانەى لەدەم هاتنە دەر:

"تۆ لەوە دەترسيت بە هۆى هەژاريتەوە گوناهێك ئەنجام بدەيت و لەبەر ئەوە ئەسرين دەڕێژيت. منيش لە كاتێكدا خوا ئەو هەموو سەروەتەى پێ بەخشيوم كەچى شەرم لە گوناهكردن ناكەم. دەبێت من لە تۆ زياتر شەرم لە خوا بكەم و لێى بترسم."

بەم جۆرە كيفل لەنێو هەستى پەشيمانيدا لە ئەنجامدانى ئەو تاوانە پاشگەزبووەوە. ئاسوودەيى و ئارامييەكى تەواو جياواز ڕووى لە دڵى

کرد. بڕێك پارەی دا بە ژنەکە و ناردییەوە. ژنە هەژارەکەش لەبەرامبەر پەروەردگاریدا کە لە حەرام پاراستبووی لەنێو کامەرانی و سوپاسگوزاریدا ڕۆشتەوە بۆ ماڵەوە بۆ لای منداڵەکانی.

ئیدی کیفل وەك جاران نەبوو. تەوبەی لەسەر هەموو ئەو گوناهانە دەکرد کە تا ئەو ڕۆژە ئەنجامی دابوون. جیاواز لە ڕۆژانی دیکە هەر زوو دەرگای دوکانەکەی داخست و گەڕایەوە بۆ ماڵەوە. ئەو شەوە تا بەرە بەیان لە خوای پەروەردگار پاڕایەوە و لە دەرگانەی ئەودا داوای لێخۆشبوونی کرد. ئەو شەوە بەرواری ئەجەل و دواشەوی ژیانی کیفل بوو کەتێیدا ڕۆحی تەسلیم بە خوای بەخشندە کردەوە.

بۆ ڕۆژی دواتر دراوسێکانی هەستیان کرد کیفل لە ماڵەکەی نەهاتووەتە دەرەوە، کاتێك دەرگاکەیان کردەوە جەستە مردووەکەی کیفلیان بەرچاو کەوت. لەم کاتەدا لەسەر دەرگاکەی بە شێوازێك کە هەمووان بتوانن بیخوێننەوە نوسراوێکی لەم شێوەیە بەدی دەکرا "خوا لە گوناهەکانی کیفل خۆشبوو."

ئەم دۆخە هەمووانی سەرسامکردبوو. خوای گەورە ئەم بەسەرهاتەی لە ڕێگای سروشەوە بۆ پێغەمبەری ئەو سەردەمە ڕەوانەکرد و بەو جۆرە سەرسامی خەڵکەکە ڕەوییەوە و مرۆڤەکان وانەیەکی گەورەیان لێوەرگرت.[١]

---

١. سنن الترمذي، القيامة ٤٩؛ الحاكم، المستدرك ٢٨٣/٤.

# شەیتان چۆن بەرسیسای لەخشتە برد

سەردەمانێکی زوو لەنێو نەوەی ئیسرائیلدا کەسێك هەبوو بە ناوی "بەرسیسا" کە زۆربەی کاتەکانی بۆ خواپەرستی تەرخان کردبوو. خەڵکی ئەویان بە پیاوچاکێك دادەنا کە نزاکانی لای خوای پەروەردگار ڕەتناکرێتەوە. بۆیە لە کاتی گرفت و کێشەکانیاندا دەچوون بۆ لای و داوای نزایان لێ دەکرد. ئەم بارودۆخەی بەرسیسا بێگومان شەیتانی دوژمنی سەرسەختی مرۆڤی بەتەواوەتی بێزارکردبوو. بۆیە بڕیاری دا هەرچۆنێك بووە لە خشتەی بەرێت.

ڕۆژێك شەیتان هەموو دەست و پێوەندەکەی کۆکردەوە و پێی وتن:

- کێ دەتوانێت بەرسیسا لەخشتە ببات؟

یەکێك لەوان وتی:

- من دەتوانم. متمانە بە من بکەن گەورەم.

ئەوە بوو شەیتانیش ئەو ئەرکەی بەو سپارد. پاشان یاریدەدەرەکەی

ئەوان دەرەق کردە ناو کۆشکی یەکێك لە سوڵتانەکانی ئەو سەردەمەی ئەوەی نیسرانیلەوە کە کچێکی جوانی هەبوو. دەستی لە کچەکە وەشاند و زیریی شێواند. بەو جۆرە کچەکە ژیریی لەدەستدا. هەموو هەوڵەکانیش بۆ چارەسەرکردنی بێسوود بوون.

لەپاش چەندین ڕۆژ یاریدەدەرەکەی شەیتان لەسەر شێوەی مرۆڤێك هات بۆ کۆشك و پێی وتن:

- گەر دەتانەوێت کچەکە چاك ببێتەوە، بیبەنە لای بەرسیسا. ئەو نزای بۆ دەکات و چاك دەبێتەوە.

پاشان کچەکەیان برد بۆ لای بەرسیسا. ئەویش نزای بۆ کرد و کچەکە چاکبووەوە و لە نەخۆشییەکەی ڕزگاری بوو. خێزانی کچەکە بەمە زۆر خۆشحاڵ بوون. کچەکەیان بردەوە و گەڕانەوە بۆ کۆشکەکە.

پاش چەند ڕۆژێك یاریدەدەرەکەی شەیتان دووبارە هاتەوە و سەری لە کچەکە شێواندەوە. پاشان دووبارە لەسەر شێوەی مرۆڤ هاتەوە بۆ لایان و پێی وتن:

- گەر دەتانەوێت کچەکەتان بەتەواوەتی چاك ببێتەوە، چەند ڕۆژێك لە لای بەرسیسا بەجێی بهێڵن.

## یاریدەدەرەکەی شەیتان دەچێتە بن کلێشەی بەرسیسا!

پاشان کچەکەیان برد و لای بەرسیسا دایاننا. بەرسیسا مانەوەی کچەکەی بە کارێکی دروست نەدەزانی. بەڵام لەبەرامبەر پێداگرییەکەیاندا هیچی پێ نەکرا و دواجار ناچاربوو داواکەی سوڵتان قەبووڵ بکات.

ئەمە دەرفەتێکی ناوازە بوو بۆ یاریدەدەرەکەی شەیتان. دەستی کرد بە هەوڵدان تا لە ڕێگای وەسوەسەوە هەستی بەرسیسا بە لای کچەکەدا بجوڵێنێت، بەڵام بەرسیسا جار بە جار زیاتر لە کچەکە دوور دەکەوتەوە.

یاریدەدەرەکەی شەیتان کۆڵی نەدا تا وای کرد ڕۆژێك بەرسیسا کەوتە داوی نەفسیەوە. نیدی ئەو گوناهێکی گەورەی ئەنجامدابوو. یاریدەدەرەکەی شەیتان خێرا هاتە لای بەرسیسا و پێی وت:

- تازە تۆ زینات لەگەڵ ئەم کچەدا کردووە. لەبەرامبەر ئەم کارەتدا لە سزای سوڵتان ڕزگارت نابێت. مەگەر کچەکە بکوژیت و جەستەکەی لەژێر زەوی پەرستگاکەدا بشاریتەوە. کە پرسیاریان لێکردیت بڵێ "کاتی مەرگی هات و کۆچی دوایی کرد." مەترسە ئەوان متمانەی تەواویان بە تۆ هەیە. یەکسەر بڕوات پێ دەکەن.

نیدی بەرسیسای نەگبەت هەستی کرد هیچ چارەیەکی نییە. قسەکانی یاریدەدەرەکەی شەیتانی جێبەجێکرد و کچەکەی کوشت و جەستەکەی شاردەوە. بەمەش دووەم تاوانی گەورەی ئەنجامدا. یاریدەدەرەکەی شەیتان هەر زوو خۆی گەیاندە لای سوڵتان و هەموو شتێکی بۆ گێڕایەوە.

سوڵتان زۆر توورەبوو. خێرا هات بۆ لای بەرسیسا. کاتێك زەوییەکەیان هەڵکەند جەستەی کچەکەیان دۆزییەوە. سوڵتان فەرمانی کرد بەرسیسا لە سێدارە بدەن. لە ساتی جێبەجێکردنی فەرمانەکەی پاشادا یاریدەدەرەکەی شەیتان هات و بە بەرسیسای وت:

- گەر بتەوێت دەتوانم لەم دۆخە ڕزگارت بکەم. پێیان دەڵێم کە تۆ ئەم

کارەت ئەنجام نەداوە و بکوژەکە کەسێکی ترە. بەڵام مەرجێکم هەیە: نکوڵی لە بوونی خوا بکە و کڕنووش بۆ من ببە.

بەرسیسا پەتی سێدارەی لە ملدا بوو. وتی:

- چۆن دەتوانم بەم حاڵەوە کڕنوشت بۆ ببەم؟

- تەنها بە ئاماژەی سەر کڕنوشم بۆ ببە بەسە!

بەرسیسا ئەوەشی کرد و بەداخەوە بووە یەکێك لە دۆڕاو و خەسارەتمەندان.[١]

١. إبن كثير، البداية و النهاية ٢/١٦٣.

# لەخوا بترسە، دەست بۆ پاکیزەییم درێژ مەکە!

پێغەمبەری سەروەرمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە فەرموودەیەکی پیرۆزدا کە بە "فەرموودەی ئەشکەوت" ناسراوە، باسی یەکێکی دیکە لە قارەمانانی پاکیزەییمان بۆ دەکات.

دەگێڕنەوە سێ کەس دەچنە گەشتێك، دوای ئەوەی شەویان بەسەردا دێت دەچنە ناو ئەشکەوتێکەوە. کاتێك لەناو ئەشکەوتەکەدا دەبن بەردێکی گەورە لە شاخەکەوە بەردەبێتەوە و دەرگای ئەشکەوتەکە دەگرێت ئیدی ناتوانن لەوێ دەربچن.

لەسەر ئەمە هەریەکەیان کردەوەیەکی خۆی کە پێی وایە لە لای خوا قەبووڵبووە، دەکاتە هۆکار و دەست بە پاڕانەوە دەکەن و داوا لە خوای گەورە دەکەن تاشەبەردەکە خل ببێتەوە و دەرچەکەیان بۆ چۆڵ بکات. بە نزای هەریەکەیان بەردەکە کەمێك دەجولێت. یەکەمیان، ڕەفتاری چاکی خۆی بەرامبەر دایك و باوکی دەکاتە هۆکار، ئەوی تریان ئەوە دەخاتە ڕوو کە جارێکیان نەیتوانیوە کرێی کرێکارەکەی بدات بەڵام دواتر کاری بە پارەکەوە

کردووە و بەزیادکراوی و بە بێ کەموکوڕیی پێی داوەتەوە، لەبەر تیشکی ڕێزی ئەو کردەوەیەیدا داوای یارمەتی لە ڕەحمەتی پەروەردگاری دەکات.

## مژدە بۆ ئەو کەسانەی کە بەپاکیزەیی دەژین!

ئەو پاڵەوانەی پاکیزەییش کە لە بابەتەکەی ئێمەدا نموونەیەکی باڵا پێشکەش دەکات دەڵێت: "خوایە گیان، کچێکی مامم هەبوو. ئەوم لە هەموو کەس زیاتر خۆش دەویست. داوای پەیوەندیم لێکرد، بەڵام ئەو هیچ ڕووی نەدامێ. تا لە ساڵێکی گرانیدا کەوتە بەردەستم. لەبەرامبەر ئەوەی خۆی تەسلیمی من بکات، سەد و بیست دینارم پێدا، ئەویش لە ناچاریدا ئەمەی قەبووڵکرد. لەو کاتەدا کە دەگەیشتم بە ویستەکەم، پێی وتم "لە خوا بترسە و دەست بۆ پاکیزەییم درێژ مەکە!"

منیش لەسەر ئەو قسەیە، سەرەڕای ئەو هەموو هەست و ئارەزووەم بۆی، وازم لێی هێنا، ئەو پارەیەشم لێ وەرنەگرتەوە کە پێم دابوو. خوایەگیان گەر من ئەمەم بۆ ڕەزامەندیی تۆ کردبێت، لەم ناڕەحەتییە ڕزگارمان بکە!"[١]

بەم جۆرە پاراستنی پاکیزەیی خۆی وەك کردەوەیەکی چاك و وەرگیراو خستە بەردەم پەروەردگار.

لە ئەنجامدا بەردەکە لا دەچێت و، ئەو جوامێرانەی نێو ئەشکەوتەکەش هەم لە ئەشکەوتەکە ڕزگاریان دەبێت و ڕەنگە هەم لە زوڵمەتی دۆزەخیش.

---

١.صحيح البخاري، الأنبياء ٥٠.

# پێت خۆشە هەمان شت لەگەڵ خوشکەکەتدا ئەنجام بدرێت؟

پێغەمبەری سەروەرمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەردەوام لەگەڵ خەم و نەهامەتییەکانی موسڵماناندا دەژیا. دیسان لەم بەسەرهاتەشدا سەرقاڵی چارەسەرکردنی کێشەی گەنجێکە.

گەنجێك هەبوو ناوی جولەیبیب بوو و تەمەنی ١٥ - ١٦ ساڵان دەبوو. ئەم گەنجە لەبەرامبەر ئافرەتاندا لاواز بوو. هاوەڵان لەم بارودۆخەی جولەیبیب نیگەران بوون، بەڵام نەیاندەزانی چۆن بیهێننەوە سەر ڕێگای ڕاست.

ڕۆژێك ئەم دۆخەیان لای پێغەمبەری خوا باسکرد. ئازیزمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بانگی کرد بۆ دیداری پیرۆزی و گفتوگۆیەك لەسەر شێوازی پرسیار و وەڵام لەنێوانیاندا گوزەرا. پێغەمبەر دەیپرسی و جولەیبیب وەڵامی دەدایەوە.

- جولەیبیب! بیستوومە خوو دەدەیتە ئافرەتان و بێزاریان دەکەیت.

- ڕاستە ئەی نێردراوی خوا! هەرچی دەکەم جڵەوی خۆمم پێ ناگیرێت.

- باشە پێم بڵێ، دەتەوێت هەمان شت لەگەڵ دایکتدا بکرێت؟

- نەخێر، ئەی نێردراوی خوا نامەوێت!

- بیرت نەچێت، ئەو کەسەی تۆ بێزاری دەکەیت دایکی یەکێکی دیکەیە! ئەی باشە دەتەوێت هەمان شت لەگەڵ خوشکەکەتدا بکرێت؟

- نەخێر، ئەی پێغەمبەری خوا!

- بیرت نەچێت ئەو کەسەی بێزاری دەکەیت خوشکی یەکێکی دیکەیە!..

پێغەمبەری خوا بەم شێوەیە چەند کەسێکی تری نزیك بۆ جولەیبیب دەژمێرێت و، لێی دەپرسێت ئایا دەیەوێت هەمان شت لەگەڵ پورەکانیدا ئەنجام بدرێت. جولەیبیبیش لە وەڵامی هەموویاندا دەڵێت "نەخێر" و پێغەمبەری خواش (صَلَّىٰاللهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) لەبەرامبەردا فەرمایشتەکانی خۆی دووپات دەکاتەوە و دەفەرمووێت:

- ئەو کەسەش کە تۆ بێزاری دەکەیت پوری کەسێکی دیکەیە!..

## جولەیبیب قایل دەبێت

جولەیبیب (رَضِيَاللهُعَنۡهُ) بەم وەڵامە پڕ حیکمەتە قایل دەبێت. پاشان پێغەمبەری خوا دەستی پیرۆزی بەرز دەکاتەوە و نزا بۆ جولەیبیب دەکات، دەفەرموێت "خوایە، لەگوناهی ئەم بەندەیەت خۆش ببە، دڵ و دەروونی خاوێن بکەرەوە و داوێنی بپارێزە"[1] پاش ئەم پاڕانەوەیەی پێغەمبەری ئازیز جولەیبیب بووە یەکێك لە پاکیزەترین مرۆڤەکانی مەدینە.

سەروەرمان (صَلَّىٰاللهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) تەنها بەمەوە ناوەستێت و جولەیبیب بەم

---

١.أحمد بن حنبل، المسند ٥/٢٥٦-٢٥٧.

حاڵەوە جێ ناهێڵێت. دەیەوێت ژنی بۆ بهێنێت. هەر بۆیە ڕۆژێك جولەیبیب دەنێرێتە لای خێزانێك کە کچێکیان هەیە کاتی شووکردنی هاتووە. خێزانەکەش خێزانێکی خانەدان و خاوەن عیففەتن. هەموو کاتێك چاوەڕوانن کچەکەیان داواکارێکی باشی هەبێت.

جولەیبیب لە دەرگا دەدات و دەچێتە ژوورەوە و سڵاوی پێغەمبەری خوایان پێ دەگەیەنێت. خێزانەکە بە بیستنی ئەمە زۆر خۆشحاڵ دەبن. پاشان جولەیبیب نیازی هاتنەکەی ڕوون دەکاتەوە و وتەکانی سەرداری مرۆڤایەتی وەك خۆی دەگەیەنێت کە فەرموویەتی:

- سڵاوی منیان پێ بگەیەنە و با کچەکەی خۆیانت بدەنێ.

دایك و باوکەکە بەدوودڵیەوە تەماشای یەکدی دەکەن وەك دەڵێن "بیدەین بە جولەیبیب؟" بەڵام شتێك پێغەمبەری خوا قسەی تێدا کردبێت گومان و دوودڵی هەڵناگرێت. کاتێك ئەوان سەبارەت بە کچەکەیان لە دوودڵیدا بوون، کچەکەیان کە گوێی لە هەموو گفتوگۆکان بوو لەپشت پەردەوە وتی:

- بۆچی گومانتان لە کەسێك هەیە کە فەرمانی پێغەمبەری خوا جێبەجێ دەکات؟[1]

## جولەیبیب لە منە و منیش لە ئەوم!

ئەوەبوو جولەیبیب هاوسەرگیریی ئەنجامدا. پاش سێ چوار هەفتە بەشداری جەنگێکی کرد و لەوێدا شەهیدکرا. دوای تەواوبوونی جەنگەکە سەروەری مرۆڤایەتی ڕوو دەکاتە هاوەڵانی و دەپرسێت:

---

١. أحمد بن حنبل، المسند ٤/٤٢٢.

- هیچ لەدەستدانێکتان هەیە؟

هاوەڵەکان لەوەڵامدا دەڵێن "نەخێر!"

ئازیزمان دەفەرموێت "بەڵام من هەمە." پاشان وەك باوکێکی خەمگینی جگەرسووتاو لە دووی جولەیبیب دەگەڕێت. کاتێك لەپاڵ حەوت بێباوەڕدا و بە جەستەی خوێناوی و پڕزام و بە شمشێرەکەی دەستییەوە بە شەهیدکراوی دەیدۆزێتەوە. ڕوودەکاتە هاوەڵانی و دەفەرموێت:

- ئەو حەوت دوژمنی کوشتووە و پاشان شەهیدبووە.

دواتر سەری جولەیبیب دەخاتە سەر ڕانی و دەفەرموێت:

- خوایە گیان، جولەیبیب لە منە و، منیش لە ئەوم.[1]

دانایی و نزا بە جۆرێك باڵیان بەخشیبوو، ئیدی ئەو بەو دوو باڵەوە بووبووە یەکێك لە باڵدارانی دوارۆژ.

بەڵێ، باوەڕدارێك کە ئیمانی ڕاستەقینەی بە خوای پەروەردگار هێنابێت، لە ژیانی ڕابردوویدا هەرچییەکی ئەنجامدابێت، پێویستە دوای ئەوەی ڕاستەڕێ دەدۆزێتەوە ژیانێکی وەها بژی کە ئەوانەی دوای خۆی هەردەم یادی خێری بکەنەوە...

---

١. صحيح المسلم، فضائل الصحابة ١٣١؛ أحمد بن حنبل، المسند ٤٢٢/٤.

# چل ڕۆژ ئەشکی پەشیمانی لەپای یەک نیگای حەرام!

ئەعلەبەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان یەکێك بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، لە پیاوانی ئەنصار بوو.

جارێکیان لە کاتی گەڕانی بە شەقامەکانی مەدینەدا چاوی چووە سەر پەنجەرەی ماڵێك. کەمێك زیاتر وردبووەوە، لەناو ماڵەکەدا خانمێکی بینی سەرقاڵی حەمامکردن بوو. بەسەر خۆیدا زاڵ نەبوو و بۆ چەند جارێکی تر لێی ڕوانی. نەدەبوو ئەمە بکات، چونکە ڕوانینی حەرام گوناهە. بێگومان ئەمەی دەزانی.

دواتر زۆر شەرمی لە خۆی کرد. هەستێکی قووڵی پەشیمانی سەرلەبەر دای گرت. لە شەرمدا مەدینەی جێهێشت. چووە سەر چیایەکی نێوان مەککە و مەدینە. چل شەو و چل ڕۆژ لەسەر ئەو چیایە گریە و ناڵەی بوو و ئەسرینی پەشیمانی دەڕشت.

کاتێك پێغەمبەری سەروەرمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەستی بە دیارنەبوونی

ئەو کرد لە ڕیزی نوێژخوێنانی مزگەوتدا، حەزرەتی عومەر و سەلمانی فارسی (رضي الله عنهما) ڕاسپارد بەشوێنیدا بگەڕێن.

ئەو دوو هاوەڵەش کەوتنە گەڕان. لەو چیایەدا کە ثەعلەبەی لێبوو چاویان بە شوانێك کەوت بە ناوی "ڕوفاقە"وە کە مەڕەکانی لە نزیك ئەو کێوەدا دەلەوەڕاند لێیان پرسی:

- ئەی ڕوفاقە! گەنجێکت بەرچاو کەوتووە لەم کێوەدا بمێنێتەوە؟

- ئەو گەنجە دەڵێن کە لە دۆزەخ ڕادەکات؟

- مەبەستت چییە؟

- ئەو کەسەی ئێوە بە دوایدا دەگەڕێن چل ڕۆژە هەردوو دەستی لەسەر سەری داناوە و بەدەم گریانەوە دەڵێت "چی دەبێت گەر خوا ڕۆحم بکێشێت و دووبارە لە ڕۆژی قیامەتدا لەنێو مرۆڤەکاندا زیندووم نەکاتەوە!"

## ئایا پێغەمبەری خوا بە گوناهەکەی من دەزانێت؟

ڕوفاقە حەزرەتی عومەر و حەزرەتی سەلمانی برد بۆ لای ثەعلەبە. شەو داهاتبوو، ثەعلەبە دەستی بە سەریەوە گرتبوو و هاتە دەرەوە و وتی:

- خۆزگە لەناو ڕۆحەکانی دیکەدا ڕۆحی من وەربگیرایەتەوە و، جەستەشم لەناو جەستەکانی دیکەدا بڵاوببوایەتەوە و نەمایە.

حەزرەتی عومەر توند لەئامێزی گرت. پاشان ثەعلەبە وتی:

- کێ دەتوانێت دڵنیایی ئەوەم پێ بدات کە لە ئاگری دۆزەخ ڕزگارم دەبێت. حەزرەتی عومەر:

- من! عومەری کوڕی خەتتاب. ثەعلەبەی لاویش پرسی:

- ئەی عومەر! پێغەمبەری خوا بە گوناهەکەی من دەزانێت؟

حەزرەتی عومەریش لە وەڵامدا وتی:

- نازانم ئایا دەزانێت یان نا. ئەوەی دەیزانم ئەوەیە کە دوێنێ شەو باسی تۆی کرد و گریا. من و سەلمانیشی بۆ ئەوە نارد تا تۆ ببەینەوە.

پاشان هەموو پێکەوە گەڕانەوە بۆ مەدینە. کاتێك گەیشتنەوە مزگەوتی پێغەمبەر، پێغەمبەری نازیزمان (صَلَّىٰاللهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) بەرنوێژیی نوێژی بەیانی بۆ هاوەڵان ئەنجامدەدا. حەزرەتی عومەر و حەزرەتی سەلمان بەرەو ریزی نوێژ ڕۆیشتن. کاتێك پێغەمبەری بەڕێز ئەڵلاهوئەکبەری نوێژی هێنا و دەستی بە خوێندنی قورئان کرد، ثەعلەبەی لاو بە گوێبیستبوونی قورئان خوێندنی پێغەمبەرگیان دونیای بەسەردا ڕووخا و لەهۆش خۆی چوو. کاتێك سەردارمان سەلامی دایەوە پرسی:

- ئەی عومەر، ئەی سەلمان! ثەعلەبەتان دۆزییەوە؟

ئەوانیش لەوەڵامدا وتیان:

- ئەوەتا لەوێیە ئەی نێردراوی خوا!

پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰاللهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) لەسەر ئەمە هەستایە سەرپێ و، هات بۆ لای ثەعلەبە و بانگی لێکرد:

- ثەعلەبە!

کاتێك ثەعلەبە دەنگی پیرۆزی نازیزمانی بەر گوێ کەوت هاتەوە هۆش خۆی و ئەم گفتوگۆیە لەنێوانیاندا ڕوویدا:

- فەرموو، فەرمان بکە ئەی نێردراوی خوا!

- هۆکاری خۆشاردنەوەت لە من چییە؟
- گوناهەکەم ئەی نێردراوی خوا.
- ئایەتێکی پیرۆزت فێر بکەم کە دەبێتە کەفارەتی هەڵە و گوناهەکان؟
- بەڵێ ئەی نێردراوی خوا!
- بە خوێندنەوەی ئەم ئایەتە نزا بکە!

﴿ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾ (البقرة: ٢٠١)

"پەروەردگارا! لە دونیا و ئاخیرەتدا چاکە و جوانیمان پێ ببەخشە و لە سزای ئاگر بمانپارێزە..."

- گوناهەکەی من لەو حەسەنەیەی نێو ئەم ئایەتە گەورەترە.
- نەخێر، وتەی پەروەردگار لە گوناهەکەی تۆش گەورەترە. دەی ئێستا برۆماڵەوە و بەردەوام بە لە داوای لێخۆشبوون.

## سەروەرمان لەسەر نوکی پێیەکانی بە ڕێگادا دەڕۆیشت.

لەپاش ئەمە ثەعلەبەی هاوەڵی لاو گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی. پاش هەفتەیەك نەخۆشکەوت. پێغەمبەری سەروەرمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) خۆی لە نزیکەوە چاودێری ثەعلەبەی دەکرد. بۆ سەردانکردنی چووە ماڵەکەی. سەری ثەعلەبەی گرت و خستییە ئامێزی پیرۆزی. بەڵام ثەعلەبە سەری لە ئامێزی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لابرد. لەبەرامبەر ئەمەدا پێغەمبەری ئازیزمان پرسی:

- بۆچی سەرت لا دەبەیت؟

- چونکە ئەو سەرە لێوانلێوە لە گوناھ!

- ھەست بە چی دەکەیت؟ ئازاری کوێت ھەیە، سکاڵات چییە؟

- ھەست دەکەم مێرووڵەیەك لەنێو پێست و گۆشت و ئێسکمدا دێت و دەچێت.

- ئارەزووی چی دەکەیت؟

- لێخۆشبوونی پەروەردگارم!

پاش ئەم قسەیە لەناکاو جوبرەئیل (عَلَيْهِ السَّلَام) لە ئاسمانەوە دابەزی و وتی:

- ئەی موحەممەد! خوا سڵاوت لێ دەکات و دەفەرموێت "گەر ئەم بەندەیەم گوناھی بە ئەندازەی ڕووی زەمینیش بووایە و بەو جۆرە ھاتبایەتە لام، بە لێخۆشبوونێکی لێوانلێوی ڕووی زەمینەوە پێشوازیم لێ دەکرد."

کاتێك پیغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەم پەیامەی جوبرەئیلی بە ثەعلەبە گەیاند، ثەعلەبە ناڵەیەکی وەھای کێشا کە ھەر لەوێدا گیانی سپارد.

پاشان بە فەرمانی پێغەمبەر ثەعلەبەیان شوشت و کفنیان کرد. کاتێك بەرەو گۆڕستانیان دەبرد سەروەرمان لەسەر نوکی پێیەکانی بە ڕێگادا دەڕۆیشت. خەڵکەکە پاش ئەوەی ثەعلەبەیان ناشت لێیان پرسی:

- ئەی نێردراوی خوا! بۆچی لەسەر نوکی پێیەکانت دەڕۆشتیت؟

ئەویش فەرمووی:

- سوێند بەو خوایەی منی وەك پێغەمبەر بە پەیامی ڕاستییەوە ناردووە،

لەبەر زۆری باڵی ئەو فریشتانەی کە لە نوێژی جەنازەی ثەعلەبەدا ئامادەبوون، نەمدەتوانی شوێنێك بۆ دانانی پێیەکانم بدۆزمەوە.[1]

١. أبو نعيم، حلية الأولياء ٩/٣٢٩-٣٣٠

# چۆن حەزرەتی جەمیلە وەک تابلۆیەکی پاکیزەیی توانی ڕێگر بێت لەبەردەم والابوونی دەرگایەکی بوهتاندا؟

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ)و هاوەڵان وەك چۆن دەرگاكانی سەر ڕێی حەرامیان دادەخست، لە شتە گوماناوییەكان و ئەو هەڵسوكەوتانەش كە دەرفەت دەدەنە شەیتان خۆیان بەدووردەگرت.

حەزرەتی حەنزەڵەی كوڕی ئەبو عامر ڕۆژێك بەر لە جەنگی ئوحود هاوسەرگیری لەگەڵ حەزرەتی جەمیلەی كچی عەبدوڵلادا كردبوو. بەیانی ڕۆژی پاش هاوسەرگیرییەكە بانگەوازێك لە شەقامەكانی مەدینەدا سەدای دەدا. ئەو بانگەوازە، بە فەرمانی پێغەمبەری خوا هاوەڵانی بۆ جیهاد بانگهێشت دەكرد.

لەو كاتەدا حەنزەڵەی كوڕی ئەبو عامر غوسڵی دەردەكرد. كاتێك گوێبیستی ئەو دەنگە بوو بەبێ ئەوەی غوسڵەكەی تەواو بكات خێرا لە حەمام هاتە دەرەوە. خۆی گۆڕی و ماڵئاوایی لە خێزانەكەی كرد و خۆی

گەیاندە سوپاکە. ناردنی مێردەکەی بۆ جیهاد، بێگومان زۆر سەخت بوو بۆ حەزرەتی جەمیلە (رضي الله عنها)، بەتایبەت بۆ جەنگێك کە دەیزانی جارێکی دیکە ناگەڕێتەوە.

ئاخر ئەوەی جەمیلە شەو لە خەونیدا بینیبووی ئاماژەی بۆ ئەوە دەکرد کە ئەو بە شەهادەت شەرەفمەند دەبێت و دەچێتەوە بۆ لای پەروەردگاری. دیاربوو ئەمە دوا ماڵئاوایی بوو.

## ئیدی بزانن ئەوە منداڵی حەنزەڵەیە!

حەزرەتی جەمیلە تەنانەت بەم حاڵەشیەوە کە دڵتەنگانە مێردەکەی بەڕێکردبوو، ژیرییەکی بێوێنەی نواند. چونکە ئەو بەم هەڵسوکەوتەی، هەوڵی دەدا خۆی و هاوسەرەکەی لە تۆمەت و، خەڵکانی تریش لە قسە و قسەڵۆك و بوختان ڕزگار بکات. ئەوەبوو یەکسەر لەپاش بەڕێکردنی هاوسەرەکەی، چوار کەسی هۆزەکەی خۆی بانگکردە ماڵەکەی. پێی وتن:

- ئەمشەو شەوی یەکەمی هاوسەرگیریی من و حەنزەڵەی کوڕی ئەبو ئەمیر بوو. گەر بە هۆی پێکەوەبوونی ئەمشەوەوە منداڵێکم ببێت، بزانن کە ئەوە منداڵی حەنزەڵەیە.

پیاوەکان زۆر سەرسامبوون، پرسییان:

- بۆچی هەستت بە پێویستیی هەواڵدانێکی لەم جۆرە کرد؟

- لە خەونمدا بینیم کە دەرگاکانی ئاسمان کراونەتەوە و، حەنزەڵەش لەو دەرگایانەوە دەچێتە ژوورەوە. کاتێك ئەو چووە ژوورەوە دەرگاکانی ئاسمان دووبارە داخران. شایەتی ئەوە دەدەن کە پێم وتن؟

میوانەكان لە وەڵامدا وتیان:

- ئێمە شایەتین لەسەر ئەوەی لە تۆمان بینی و بیستمان.[1]

حەزرەتی جەمیلە بەم هەڵوێستە ژیرانەیەی هەم خۆی و هەم حەزرەتی حەنزەڵەی كوڕی ئەبو عامری هاوسەری لەوە دەپاراست بكەونە ژێر باری تۆمەتەوە. بەم جۆرەش دەرگاكانی بە ڕووی گومانخراپی و غەیبەت و بوختاندا داخست.

## حوكمی بوختانكردن لە ئایینەكەماندا چییە؟

بوختان بریتییە لە بەلاڕێدابردنی ڕاستی و درۆكردن بە مەبەستی تۆمەتباركردنی كەسی بەرامبەر بە كارێك كە لە بنەڕەتدا ئەنجامی نەداوە. هۆكاری بوختانكردنیش بۆ ئیرەییبردن و ویستی زیانگەیاندن و بەو كەسە دەگەڕێتەوە. لە فەرهەنگیشدا ئەم وشەیە بە واتاكانی وەك درۆ بەدەمەوە كردن و، قسە هەڵبەستن، قسەدانەپاڵی بێبنەما هاتووە.

پێغەمبەری سەروەرمان كە بەردەوام هەوڵی داوە موسڵمانان لە هەموو كار و كردەوەیەكی نادروست بەدوور بگرێت، لە بابەتی بوختانیشدا بەڕوونی ئاگاداری كردوونەتەوە. ئازیزمان لەو كاتەدا كە بەیعەتی لە موسڵمانە تازەكان وەردەگرت، لەپاڵ مەرجە سەرەكییەكانی وەك هاوبەش بۆ خوا بڕیارنەدان و زینا و دزی نەكردندا، دووركەوتنەوەی لە بوختانیش وەك مەرجێك بۆ دادەنان و داوای بەڵێنی لێ دەكردن، ئەمەش دەرخەری ئەوەیە كە بوختان لە ڕوانگەی ئایینەوە كردەوەیەكی چەندە بێزراوە.

---

١. ابن منظور، المختصر ١٢/١٢٥.

لە هەمان کاتدا ئەو کەسەی بوختان هەڵدەبەستێت سەرپێچی ئەو ئایەت و فەرموودە پیرۆزانە دەکات کە فەرمان بە ڕاستی و ڕاستگۆیی و دادپەروەری دەکەن وەك:

﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ﴾

(الحجرات: ١٠)

لە ڕاستیدا هەر ئیمانداران برای یەکن، کەواتە هەرکاتێك لەنێوان دوو براتاندا ناکۆکی پەیدابوو، ئێوە نێوانیان چاك بکەن و ئاشتیان بکەنەوە.

"موسڵمان ئەو کەسەیە موسڵمانانی دیکە لە دەست و زمانی پارێزراو بن"،[1] "هیچ یەکێك لە ئێوە بە باوەڕداری تەواو هەژمار ناکرێت تا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براکەشی پێی خۆش نەبێت."[2]

پێغەمبەری سەروەرمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە فەرموودەکانیدا ئەوەی خستووەتە ڕوو کە باسکردنی کەموکورتیی کەسێك غەیبەتە، بەڵام ئەگەر کەموکورتی و تاوانێك بێبنەما بدرێتە پاڵ کەسێك ئەوە بوختانە. لە هەمان کاتدا ئەو کەسەی کە بوختان دەکات، لەپاڵ ئەوەدا کە گوناهی درۆی دەچێتە ئەستۆ، لە لایەکی ترەوە مافی بەندەیەکیشی دێتە سەر و دەبێتە هۆکار بۆ زیانگەیاندن بە برایەتی و، پێکەوەیی و، تەبایی نێوان ئیمانداران.

هەربۆیە بوختان کارێکی حەرامە و هەرگیز ناکرێت ببێتە سیفەتی ئیماندار. لەگەڵ ئەوەشدا نابێت مرۆڤی موسڵمان کاتێك ئەم گوناهەی لەبەرامبەردا ئەنجام دەدرێت بچێت لە هاوچەشنی خۆی بەرپەرچی بداتەوە، بەڵکو پێویستە هەوڵ بدات بە شێوازە ڕێپێدراوەکان بەدرۆی بخاتەوە.

١. صحيح البخاری، الإيمان ٤.

٢. صحيح البخاری، الإيمان ٧.

# هەستیاریی حەزرەتی عائیشەی دایکمان لەمەڕ داپۆشراوی

کاتێك لە سەرچاوەکانمان دەڕوانین، دەبینین حەزرەتی عائیشەی دایکمان (رضيَ اللهُ عَنْها) لەمەڕ بابەتی داپۆشراوی زۆر هەستیار بووە و، ئەو کەسانەی ئاگادارکردووەتەوە کە لەم بابەتەدا هەستیارییان نەنواندووە.

ڕۆژێکیان حەفصەی کچی عەبدورڕەحمانی برای هات بۆ سەردانکردنی. کاتێك دایکمان سەرپۆشە تەنکەکەی سەری برازاکەی بینی، خێرا لێی وەرگرت و لەپێشدا دوو توێی کرد و پاشان بەجوانی شێوازی سەرداپۆشینی نیشاندا. دواتر هێنایە بەرامبەری و بەم شێوەیە ئاگاداری کردەوە:

- ئاگات لەوە نییە کە خوای پەروەردگار لە سورەتی نووردا دای بەزاندووە؟

هەر بەمەشەوە نەوەستا و لەچکێکی ئەستوورتری لەوانەی چواردەوری داواکرد و سەری برازەکەیی پێداپۆشی، بە ئاماژەی ئەوەی ئیدی بەو شێوەیە خۆی داپۆشێت.[1]

---

١. الإمام مالك، موطأ، اللباس ٤.

هێندە هەستیاربوو لەمەڕ ئەم بابەتە کە جەختی لەسەر داپۆشینی ڕووخساریش دەکردەوە وەك پاراستنێکی زیاتر بۆ خانمان.

حەزرەتی عائیشە بە باسکردنی ڕووداوەکانی نێو ژیانی ڕۆژانەی خۆی لەگەڵ نازیزماندا، چۆنییەتی خۆداپۆشینی لە خانمان دەگەیاند. لە یەکێك لەو ڕووداوانەدا بۆمان دەگێڕێتەوە:

- لە سەردەمی پێغەمبەردا (صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کە ئێمە لە ئیحرامدا دەبووین کاتێك ئەسپسوارەکان لە شوێنەکەمان نزیك دەبوونەوە یەکسەر سەرپۆشەکانمان بەسەر ڕووخسارماندا دەدا و کە دووریش دەکەوتنەوە دیسان ڕوخسارمان دەکردەوە.[1]

## دایکمان لەپشتی پەردەوە قسەی لەگەڵ پیاواندا دەکرد.

ئەمە لە کاتێکدایە کە لە سەروبەندی بەجێهێنانی فەریزەی حەجدا بوون و، زانا گەورەکانی وەك ئەبو حەنیفەش ئاماژە بەوە دەکەن کە ژنان دەتوانن لە ئیحرامدا ڕوخساریان دەربخەن. چونکە زەمینەکە زەمینەی خواپەرستییە و بە بەراورد لەگەڵ کاتەکانی تردا ئەگەری فیتنە تێیدا کەمترە.

بەڵام هەستیاریی حەزرەتی عائیشەی دایکمان جیاوازترە و بەو ڕەفتارەی ئەو ڕۆژەیان دەریان خستووە کە لە کاتی تێپەڕینی کەسانی بێگانە بە لایاندا، گەر لە ئیحرامیشدا بووبن، ڕوخساریان داپۆشیوە.

تەنانەت باسی ئەو گرفتانەمان بۆ دەکات کە بە هۆی ئەم هەستیارییەوە تووشی هاتووە و بەگێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی ژیانی خۆی گوزارشت لەوە

---

١. سنن ابي داود، المناسك ٣٤.

دەکات کە دەبێت سەرەڕای هەموو شتێك دەستبەردای هەستیاریمان نەبین لە خۆداپۆشیندا.

بۆ نموونە کاتێك لە سەروبەندی حەجی ماڵئاواییدا نەخۆش دەکەوێت و ناچار دەبێت بۆ ئەوەی دووبارە بچێتەوە نێو ئیحرام، لەگەڵ خوشکەکەیدا بچێت بۆ تەنعیم، کۆمەڵێك گرفتی زۆر دێنە ڕێگای، بەڵام ئەو سەرەڕای هەموو شتێك نە ئەو ڕۆژە و نە ڕۆژەکانی دواتر هێندەی گەردێك دەستبەرداری هەمان ئەو هەستیارییەی خۆی نەبوو. وەك بڵێیت بیەوێت بەم هەڵوێستەی ئەوەمان بۆ بسەلمێنێت کە ئەوانەی باسی دەکات پارچەیەك نین لە خەیاڵ، بەڵکو هەریەکەیان ڕاستییەکن و بەرِوونی لە ژیانی خۆیدا ڕەنگیان داوەتەوە.

ژیانی خۆی سەرلەبەر سیمای وانەیەکی پڕ واتا بوو. عائیشەی دایکمان چی لەدەست هاتبایە دەیکرد تا بتوانێت بە جوانترین شێواز پێشوازی لەوانە بکات کە دێنە خزمەتی. کاتێکیش کەسێکی نامەحرەم دەهات، خێرا پەردەی دادەدایەوە و سەرباری ئەوەی قورئانی پیرۆز چەسپاندبووی کە دایکی سەرجەمی ئیماندارانە، بەڵام ئەو لەپشت پەردەوە قسەی لەگەڵدا دەکردن.[١]

## ئەو ئافرەتەی بڕوای بە سورەتی نور هەبێت بەم شێوەیە خۆی ناگۆڕێت!

تا بە تێپەڕینی کات گۆڕانکارییە هاوشێوەکانی ببینییایە، بە حەسرەتی سەردەمی پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەڕۆشتەوە بۆ ئەو ڕۆژانە و، خانمانی ئەو سەردەمە و هەستاریی بێوێنەیانی لەمەڕ بەجێهێنانی

١. بڕوانە: أحمد بن حنبل، المسند ٦/٢١٩.

فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەرەکەی یاد دەکردەوە. لەبەرامبەر دیمەنێکی وادا هەناسەیەکی قووڵی هەڵدەکێشا و دەیوت:

- خوای گەورە (جَلَّ جَلَالُهُ) میهر و سۆزی خۆی بەسەر یەکەمین ئافرەتانی کۆچبەردا برژێنێت! کاتێك خوا فەرمانی دا و فەرمووی:

﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ ﴾ (النور: ٣١)

"بە ئافرەتانی ئیمانداریش بڵێ: چاویان بپارێزن (لە تەماشای نامەحرەم) داوێنی خۆیان بپارێزن لە گوناه و جوانیی خۆیان دەرنەخەن جگە لەوەی کە دیارە (وەك دەم و چاو و دەست) با سەرپۆشەکانیان بدەن بەسەر سینە و ملیاندا و جوانی و زینەتی خۆیان دەرنەخەن بەتەواوی بۆ هاوسەرەکانیان نەبێت."

دەستبەجێ پۆشاکەکانیان لە خۆیانەوە پێچا و، کەوتنە کێبڕکێ بۆ بەجێهێنانی ئەم فەرمانەی خوای پەروەردگار![1]

هەواڵی ئەوەی پێگەیشتبوو کە لە وڵاتە تازە فەتحکراوەکاندا هەندێك لە ئافرەتان بە بەراورد لەگەڵ ڕابردوودا، ئازادانەتر دەسووڕێنەوە و لە دەرەوەی ماڵەکانی خۆیاندا بێپەرواتر مامەڵە دەکەن. ئەمە خەمباری کردبوو. ڕۆژێك ژنەکانی شاری حیمص بە مەبەستی سەردانکردنی هاتن بۆ لای، ئەویش لێیان تووڕەبوو و وتی:

- نەکا ئێوە ئەو ژنانە بن کە دەچن بۆ حەمامی گشتی! بیرتان نەچێت من

---

١. صحيح البخاري، التفسير ٣١.

گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا دەیفەرموو "ئەو ئافرەتەی پۆشاکەکانی بەری بێجگە لە ماڵی مێردەکەی لە شوێنێکی تر دابنێت، پەردەی نێوان خۆی و خوای دڕاندووە."[١]

کاتێك حەزرەتی عائیشە پۆشاکی بەری ئافرەتەکانی بینی کە گەر بە پێی پێوەرەکانی ئەو سەردەمەش بوو، گۆڕانیان بەسەردا هاتبوو، دیمەنەکەی بە نامۆ زانی و ئاگاداری کردنەوە:

- هەر ژنێك بڕوای بە سورەتی نور هەبێت بەم شێوەیە خۆی ناگۆڕێت! ئەگەر ئێوە لە باوەڕدارانن، ئەوە بزانن ئەو جل و پۆشاکەی لەبەرتاندایە جل و پۆشاکی ئافرەتانی باوەڕدار نییە.[٢]

## ئایا خۆداپۆشین تەنها داپۆشینی سەرە؟

پاکیزەیی لە بنەڕەتدا بە خاوێنی و پاراوی هەست و بیرکردنەوە دەست پێ دەکات. پاکیزەیی کەسێك سەرەتا بە دوورکەوتنەوەی لە هەموو جۆرە گوفتار و کردارێکی نەشیاو بەرجەستە دەبێت، بە نیشاندانی عەزم و پێداگرییەکی نەبڕاوە لەمەڕ دەستبەردارنەبوونی ڕەوشت و شەرم و شکۆ لە هەموو حاڵ و هەڵسوکەوتێکیدا دێتە ئاراوە.

بە دەربڕینێکی تر؛ پاکیزەیی پێش پاراستنی ئەندامانی جەستە لەو هەڵسوکەوتانەی پێچەوانەی ڕەوشت، لە دڵدا سەرهەڵدەدات، کە ئەمەش لە ڕێگای بەرەنگاربوونەوەی حەزە نادروستە جەستەییەکان و لەسنور

١. أحمد بن حنبل، المسند ٤١/٦.

٢. بڕوانە: القرطبي، الجامع لأحكام القرآن ١٥٧/١٤.

دەرچوونەکانی نەفس بەرجەستە دەبێت. ئەمەش لە ڕێگای ئەوەوە دەبێت کە مرۆڤ بەگشتی و خانمان بە تایبەتی کە لێرەدا جێگەی باسەکەمانن زیاد لەو گرنگییەی کە دەیدات بە جوانیی دەرەوەی و بەرگ و پۆشاکەکەی، گرنگی بەو تایبەتمەندییانە بدات کە جوانیی ناوەوەن، وەك شکۆ و پاکیزەیی و چاکەکاری.

بەپێچەوانەوە ئەو خانمەی لەم هەستە قووڵەی ناخ و بەهای پاکیزەیی و ویقار بێبەشە، کە ئەمانەش هۆکارن بۆ بەرزبوونەوەی مرۆڤ بۆ پلەیەکی بڵندتر لە فریشتە، ئەو بایەخەی کە بە پۆشاکی دەرەوەی دەیدات، تەنها دەبێتە بەرگێکی درۆزن کە خۆڵ لە چاوی مرۆڤەکان دەنێت. چونکە ئافرەتێك پاکیزەیی لەژێر پرسیاردا بێت، وەك پارەیەکی بێبەها وایە و، کاتێك نزیك بە ئەستەمە نەوەیەکی تەندروست لە ئامێزی ئەودا پەروەردە ببێت.

هەربۆیە وەك چۆن پێویستە ئافرەت گرنگی بە شیاویی ئەو بەرگە بدات کە دەیپۆشێت، بە هەمان شێوە دەبێت لە هەست و بیر و گوفتار و کردارەکانیشیدا ئەو پاکیزەیی و نەزاهەتە بنوێنێت کە شایەنییەتی. دەبێت ئەو لە هەستان و دانیشتن و ڕۆیشتن و قسەکردنیدا هەردەم پاك و پاراو و، خاوەن شەرم و شکۆ بێت. لە لایەکەوە لە بابەتی داپۆشراویدا فەرمانەکانی ئیسلام بەجێ بهێنێت و، لەولاشەوە بە هەموو گوفتار و کردارەکانییەوە هەوڵ بدات ببێتە نوێنەری پاکیزەیی.

بەدڵنیاییەوە ئەم دۆخە پیاوانیش دەگرێتەوە. لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار بێ جیاکاری ژن و پیاو و، لەپێناو تەندروستیی خێزاندا لە زۆر شوێنی قورئانی پیرۆزدا داوا دەکات پارێزگاری لە شکۆ و پاکیزەیی بکرێت

و فەرمانمان پێ دەکات لە هەموو بەدڕەوشتییەك بەدوور بین. بۆ نموونە، لە شوێنێکدا دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلْخَٰشِعِينَ وَٱلْخَٰشِعَٰتِ وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلْحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴾

(الأحزاب: ٣٥)

"بەڕاستی پیاوان و ئافرەتانی موسڵمان، پیاوان و ئافرەتانی ئیماندار، پیاوان و ئافرەتانی ملکەچ و فەرمانبەردار، پیاوان و ئافرەتانی ڕاستگۆ، پیاوان و ئافرەتانی خۆگر، پیاوان و ئافرەتانی لەخواترس، پیاوان و ئافرەتانی بەخشندە، پیاوان و ئافرەتانی ڕۆژووەوان، پیاوان و ئافرەتانی داوێنپاك و ئەو پیاو و ئافرەتانەی کە زۆر یادی خوا دەکەن، بەخشین و لێبوردەیی و پاداشتی زۆر مەزن و بێسنووریان لە لایەن خوای گەورەوە بۆ ئامادەکراوە (هەر کە دونیایان بەجێهێشت پێی شاد دەبن)."

لە شوێنێکی دیکەشدا دەفەرموێت:

﴿ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَٰفِظُونَ ﴿٢٩﴾ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ﴿٣٠﴾ فَمَنِ ٱبْتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْعَادُونَ ﴿٣١﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِأَمَٰنَٰتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَٰعُونَ ﴿٣٢﴾ وَٱلَّذِينَ هُم بِشَهَٰدَٰتِهِمْ قَآئِمُونَ ﴿٣٣﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٣٤﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى جَنَّٰتٍ مُّكْرَمُونَ ﴾

(المعارج: ٢٩-٣٥)

"ئەوانەی داوێنی خۆیان دەپارێزن، مەگەر لەگەڵ هاوسەرەکانیاندا یاخود کەنیزەکەکانیان (کە بە هۆی بارودۆخی تایبەتەوە هەبوو)، ئەوانە بەڕاستی لۆمەکراو نابن، جا ئەوەی بێجگە لەو حاڵەتانە ڕێگەی تر بگرێت (بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانی)، ئەوانە لە سنوورترازاو و دەستدرێژکەرن، هەروەها ئەوانەی کە ئەمانەت دەپارێزن و پەیمان دەبەنەسەر، ئەوانەی کە هەڵدەستن بەو شایەتییەی کە لە لایانە، ئەوانەی کە پارێزگاری نوێژەکانیان دەکەن و (لە کاتی خۆیدا ئەنجامی دەدەن)، ئا ئەوانە لە باخەکانی بەهەشتدا ڕێزلێنراون."

پێغەمبەری سەروەریشمان لە فەرموودەیەکیدا دەفەرموێت "ئەو کەسەی بەڵێنی پاراستنی دەمی و داوێنیم پێ بدات، منیش بەڵێنی چوونە بەهەشتی پێ دەدەم."[1]

لەبەر ئەمەیە وتراوە "ئێوە خاوەن پاکیزەیی بن، تا خێزانەکەتان و منداڵەکانیشتان خاوەن پاکیزەیی بن. ئێوە بەباشی مامەڵە لەگەڵ باوکتاندا بکەن تا منداڵەکانیشتان مامەڵەی باش لەگەڵ ئێوەدا بکەن."[2] چونکە سزا لە چەشنی کردەوە دەبێت. چۆن مامەڵە بکەن، ئێوەش بەو شێوەیە مامەڵەتان لەگەڵدا دەکرێت. چارەنووسی ئەنجامدانی خراپەش، بریتییە لە ڕووبەڕووبوونەوەی خراپە.

---

١. صحيح البخاري، الحدود ١٩.

٢. أبو بكر الشافعي، كتاب الفوائد، ١٣٩/١(١٠٠)؛ ديلمي، الفردوس، ٥٢/٥ (٧٤٣٤)؛ رشيد هايلاماز، أم المؤمنين عائشة.

# لەوانەیە تۆ من نەبینیت، بەڵام من تۆ دەبینم!

پێشتر باسمان لە هەستیاریی حەزرەتی عائیشەی دایکمان کرد (رضي الله عنها) ەمەر پاکیزەیی و داپۆشراوی. بە پێویستی دەزانین ئەم ڕووداوەی ژیانی ئەو لەنێو پەڕەکانی ئەم پەرتووکەماندا بێت کە بۆ باسکردنی قارەمانانی پاکیزەیی تەرخانمان کردووە.

ڕۆژێك لە ڕۆژان یەکێك لە شوێنکەوتووە پایەبەرزەکان کە بەختەوەربووبوو بە بینینی پۆلی هاوەڵان حەزرەتی ئیسحاق بوو، هاتە خزمەت حەزرەتی عائیشەی دایکمان. دایکمان دیسان چووبووە پشت پەردەوە. لە کاتێکدا حەزرەتی ئیسحاق نابینا بوو، بۆیە ئەم هەڵوێستەی دایکمانی پێ نامۆ بوو و وتی:

- بۆچی دەچیتە پشت پەردەوە لە کاتێکدا من نابینام و تۆ نابینم!

لەبەرامبەردا حەزرەتی عائیشەی دایکمان وتی:

- ڕەنگە تۆ من نەبینیت، بەڵام من تۆ دەبینم![1]

---

١. إبن سعد، الطبقات الكبرى ٨/٦٩.

ئەو هێندە هەستیاربوو کە تەنانەت کاتێك مامی شیریی خۆیشی سەردانی کرد، هەستی بەنائارامی دەکرد هەرچەندە مەحرەمیشی بوو. دوای ئەوەی خەڵکی بەنامۆیی پرسیاریان لە هۆکاری ئەمە کرد، لە وەڵامدا وتی:

- خاتوونەکەی شیری پێداوم نەوەك خۆی.

دیاربوو هێشتا حوکمی ئەمە ڕوون نەبووبووەوە و دایکیشمان بە پێی پێوەرەکانی گەیشتبووە ئەم ئەنجامە. دواجار پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هات، کاتێك دایکمان بابەتەکەی لەو گەیاند، ڕاستی مەسەلەکەی بۆ ڕوونبووەوە. چونکە ئازیزمان پێی فەرموو:

- ئەو مامی تۆیە؛ ڕێگا بدە بێت بۆ سەردانت![1]

بەپێی گێڕانەوەی ئیبن عەباس (رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ)، حەزرەتی عایشە تەنانەت کاتێك حەسەن و حوسەینی نەوەی پێغەمبەری خوا دەهاتن، خۆی دادەپۆشی و دەستبەرداری ئەم هەستیارییەی نەدەبوو. حەزرەتی حەسەن و حوسەینیش لەبەر ئەم هەستیارییەدا هەموو کات نەدەهاتنە نێو خانمەکانی پێغەمبەری خواوە و، لەبەر ئەوەی درکیان بەم هەستیارییەی دایکانمان کردبوو وریاتر مامەڵەیان دەکرد.[2]

## دایکمان تابلۆیەکی داوێنپاکی بوو

حەزرەتی عایشە گەر بۆ خواپەرستیش بووایە تێکەڵی قەرەباڵخی نەدەبوو، هەوڵی دەدا لە بەجێهێنانی عەمرەدا تەوافەکەی لەو کاتانەدا ئەنجام بدات

---

١. صحيح البخاري، الشهادات ٧.

٢. ابن سعد، الطبقات الكبرى ٨/٥٨.

کە دەوروبەری کەعبە چۆڵتر بوو. کاتێك تەوافی کەعبەی دەکرد یەکێك لە ئافرەتەکان پێی وت:

- ئەی دایکی ئیمانداران! وەرە با ئیستیلام بکەین.

مەبەستی لەوە بوو پێکەوە بچنە نزیك بەردە ڕەشەکەوە و سڵاوی لێ بکەن. ئەویش ئاوڕی بۆ دایەوە و وتی:

- چۆن دەکرێت بچینە نێو قەرەباڵغییەکی وەهاوە!

بەم شێوەیە پێشنیاری ژنەکەی ڕەتکردەوە.[1]

ئەوانەی ئەم هەستیارییەی ئەویان دەزانی، هەر کە دەیانبیست دایکمان دێتە مەیدانی تەوافەوە، دەستبەجێ ئەوێیان لە پیاوان خاڵی دەکردەوە و بەو شێوەیە هەوڵیان دەدا زەمینەیەك بڕەخسێنن تا دایکمان ئاسوودەتر تەوافەکەی بەجێ بهێنێت.[2] تەنانەت هەندێك کەس بۆ ئەو مەبەستە ڕادەسپێرران تا مەیدانی تەواف بهێننە ئەو شێوازەوە کە حەزرەتی عائیشەی دایکمان تەوافی تێدا ئەنجام دەدات.

## ئیدی تۆ نامەحرەمیت بۆ من!

حەزرەتی عائیشە لە کاتی پێویستیدا ئەوەی کە دەیزانی بە شێوەیەکی کرداری نیشانی ئەو قوتابییانەی دەدا کە مەحرەمی بوون. بۆ نموونە، یەکێك لە خزمە نزیکەکانی کۆیلەیەکی هەبوو بەناوی سالمەوە؛ ڕۆژێك هات و داوای لە دایکمان کرد فێری دەستنوێژ شوشتنی بکات. ئەویش دەقاودەق چۆن لە پێغەمبەری خوای بینیبوو فێری ئەوی کرد.

١. صحيح البخاري، الحج ٦٣.

٢. بڕوانە: صحيح البخاري، الحج ٦٣.

تا ئێره کێشەی نەبوو، چونکە سالم کۆیلەی کەسێك بوو کە مەحرەمی دایکمان بوو، بۆیە لە لایەنێکەوە دایکمان ئەویشی بە مەحرەم دەزانی.

پاش تێپەڕینی ماوەیەك سالم دیسان هاتە لای دایکمان و وتی:

- ئەی دایکی ئیمانداران، "نزام بۆ بکە!"

ئەمە داواکارییەك بوو کە لە یەکەم ساتدا هۆکارەکەی ڕوون نەبوو، بۆیە دایکمان یەکسەر پرسی:

- بۆچی؟

سالم ویستی حەزرەتی عائیشە بکاتە هاوبەشی خۆشییەکەی و وتی:

- خوای گەورە ئازادیی پێبەخشیم.

تا ئێرە گرفتێك نەبوو؛ دایکمان ڕووی کردە سالم و وتی "خوا موبارەکی بکات." هەر کە ئەم نزایەی کرد، خێرا پەردەکەی داگرتە نێوانەوە! چونکە ئیدی ئەویش بێگانە بوو بۆی، لەو ڕۆژەشەوە ئیدی هەردەم لەپشت پەردەوە قسەی لەگەڵ سالمدا کرد.[١]

---

١. سنن النسائي، الطهارة ٨٣.

# ئەبو مەرسەد چۆن خۆی لە زینا پاراست؟

کاتێك موسڵمانان کۆچیان کرد بۆ مەدینە، ژمارەیەکی دیاریش لە هاوەڵان لە مەککە مابوونەوە. هەندێك لەمانە هێندە بێهێز و بێدەسەڵات بوون نەیاندەتوانی لەماڵ بێنە دەرەوە. ئەوانی تریشیان بەندکرابوون. گەرچی بەشێك لە زیندانیان دەرفەتی هەڵهاتنیان بۆ ڕەخسا و خۆیان دەربازکرد، بەڵام کۆمەڵێکی تریان هێشتا هەر بەند بوون.

جگە لەمەش لەپاش ڕووداوی (بئر معونة) دوو هاوەڵی دیکە دەستبەسەرکران و خرانە زیندانەوە. پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ڕێگای جۆراوجۆری تاقیکردەوە بۆ ڕزگارکردنی ئەم هاوەڵانە. یەکێك لەو کەسانەش کە پێغەرمبەری خوا بۆ ئەم مەبەستە ڕای سپارد، ئەبو مەرسەد (أبو مرسد) بوو.

ڕۆژێکیان سەروەرمان ئەبو مەرسەدی بانگکرد و ڕایسپارد بگەڕێتەوە بۆ مەککە تا ئەو هاوەڵانە ڕزگار بکات کە لەژێر دەستی قورەیشدا دیل بوون. پاش ئەو فەرمانە ئەبو مەرسەد خۆی ئامادەکرد و بەرەو مەککە کەوتە ڕێ.

ئەرکەکەی ئەبو مەرسەد زۆر دژوار بوو، چونکە هەموو دانیشتووانی مەککە ئەویان دەناسی.

ئەبو مەرسەد لەپێش موسڵمانبوونیدا ئافرەتێکی دەناسی ناوی "عەناق" بوو. پێش موسڵمانبوون لەگەڵ ئەم ئافرەتەدا پەیوەندییەکی خۆشەویستییان هەبوو. کاتێك بانگەوازی ئیسلام دەستی پێکرد ئەبو مەرسەد موسڵمان بوو، بەڵام ئافرەتەکە لەسەر بێباوەڕییەکەی بەردەوامبوو.

خۆشەویستیی پێغەمبەری خوا و ئیسلام و خەبات بۆ بانگەواز ڕێگای ئەبو مەرسەد و ئەو ئافرەتەی جوداکردبووەوە و، سەرەڕای خۆشەویستییەکەی وازی لە عەناق هێنابوو.

ئەم هاوەڵە بەڕێزە کە تەواوی هزری لەسەر ئەنجامدانی ئەرکەکەی چڕکردبوویەوە و هەوڵیدا ئەو خانمە لەبیر خۆی بباتەوە، هەر کە پێی نایە مەککەوە، ڕووبەڕووی عەناق بووەوە. بۆیە خێرا لە شوێنێکدا خۆی حەشاردا. پاشان بەئەسپایی ئەوێی جێهێشت و چووە ماڵی یەکێك لە هاوەڵە متمانەپێکراوەکانی. پاش ئەوەی چاویان بە یەکتری کەوت، بەڵێنی لە هاوەڵەکەی وەرگرت لە هەڵمەتی ئازادکردنەکەدا هاوکاریی بکات. پێکەوە پلانیان دانا کە شەو داهات لەپشت دیوارێکدا یەکدی ببینن.

## سەرەڕای تێپەڕینی ساڵانێك، منی لەیاد نەکردبوو

با لە حەزرەتی ئەبو مەرسەد خۆیەوە گوێبیستی تەواوکاریی ڕووداوەکە ببین:

کە دونیا تاریك داهات، بەئەسپایی چووم بۆ ئەو شوێنەی کە لەگەڵ

هاوڕێکەمدا دیاریمان کردبوو. مانگەشەو بوو. لە شوێنێکدا خۆم حەشاردا و کەوتمە چاوەڕوانیی هاوڕێکەم. پاش کەمێك عەناق بەوێدا هات، منی بینی و بە سێبەرەکەمدا ناسیمییەوە. بەخێرایی و بەهەناسەبڕکێ هات بۆ لام. بە تاسە و سەرسامییەکی زۆرەوە هاواری کرد:

- ئەبو مەرسەد!

منیش بەئاماژە پێم وت بێدەنگ بە. پاشان بە دەنگی نزم وتم:

- بەڵێ ئەبو مەرسەدم!

زۆری پێخۆشبوو کە یەکدیمان بینییەوە. سەرەڕای تێپەڕینی ساڵانێك لەیادی نەکردبووم. پاش کەمێك گفتوگۆ، تێگەیشت کە بۆچی هاتووم. بەڵام هیچی نەوت. دواتر وتی:

- دەی با بچینەوە بۆ ماڵەکەم، ئەمشەو لەگەڵ مندا بمێنەرەوە.

منیش وتم:

- ئەی عەناق! خوا زینای حەرامکردووە. ئیسلام زۆر شتی قەدەغە کردووە کە لە سەردەمی نەزانیدا دەمانکرد.

پاشان وتی:

- مادام با هاوسەرگیری بکەین!

لەم بابەتەدا زۆر پێداگریی کرد. منیش پێم وت:

- منیش دەمەوێت لەگەڵ تۆدا هاوسەرگیری بکەم. بەڵام تا پرس بە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) نەکەم و، مۆڵەتی لێ نەخوازم هەرگیز کارێکی وا ئەنجام نادەم.

هەوڵی دا ڕازیم بکات تا ئەو شەوەی لەگەڵدا بەسەربەرم، بەڵام منیش پێداگر بووم لەسەر قەبووڵنەکردنی داواکارییەکەی. کاتێك تێگەیشت ناتوانێت ڕازیم بکات، بە هەموو هێز و توانای خۆی هاواری کرد:

- ئەی خەڵکی مەککە! ئەم پیاوە زیندانییەکان دەرفێنێت!

## خوا منی نیشانی ئەوان نەدا

خەڵکی مەککە کە گوێبیستی ئەمە بوون، بەرەو لای ئێمە هاتن. منیش بە هەموو توانای خۆمەوە ڕامکرد و لەوێ دوورکەوتمەوە. هەشت کەس بە دوامەوە بوون. لە تاریکییەکەدا بەزەحمەت خۆم گەیاندە چیای "خەندەمە" و لەوێدا خۆم لەنێو ئەشکەوتێکدا حەشاردا. پاش کەمێك پیاوەکان هاتنە بەردەم ئەشکەوتەکە و لەپەنامدا وەستان، کەچی سەرەڕای ئەوەی لێیان دەڕوانیم منیان نەدەبینی. بەڵێ، خوای پەروەردگار منی نیشانی ئەوان نەدەدا.

پیاوەکان ماوەیەك لەوێدا سووڕانەوە، کە زانییان من نادۆزنەوە گەڕانەوە. پاش ڕۆیشتنی ئەوان لەوێ هاتمە دەرەوە. بەوریاییی تەماشای چواردەورم کرد. کە زانیم کەس لەو دەورە نەماوە، وردەوردە گەڕامەوە بۆ شار. لە شوێنێکی دوورەدەست چاوەڕێم کرد تا خەڵکی نوستن و شار خامۆشبوو.

پاش ئەوەی خامۆشی باڵی بەسەر شاردا کێشا، خۆم گەیاندە زیندانییەکان و لەوێ دەربازم کردن و پاشان پێکەوە بەڕێکەوتین بۆ مەدینە.

کاتێك گەشتینەوە مەدینە هەموو بەسەرهاتەکەم بۆ پێغەمبەر و کۆمەڵی هاوەڵان گێڕایەوە. نەمتوانیبوو عەناق لەیادبکەم، داوای مۆڵەتم لە پێغەمبەری خوا کرد تا هاوسەرگیریی لەگەڵدا بکەم.

ئەوە بوو خوای گەورە ئەم ئایەتە پیرۆزەی دابەزاند:

﴿ ٱلزَّانِى لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ ۚ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ (النور: ٣)

"پیاوی زیناکەر تەنها ئافرەتی زیناکەر یاخود موشریك مارە دەکات. ئافرەتی زیناکەریش تەنها پیاوی زیناکەر یاخود موشریك مارەی دەکات. (هاوسەریتی پیاوان و ئافرەتانێك کە بەردەوامن لەسەر زینا)، ئەوە لەسەر ئیمانداران حەرامکراوە."

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بانگی کردمە لای خۆی، پاش ئەوەی ئایەتە پیرۆزەکەی بۆ خوێندمەوە، فەرمووی "هاوسەرگیری لەگەڵدا مەکە!"

منیش پاش ئەم وەڵامەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەوڵم دا ئیدی لەیادی بکەم.[1]

---

١. سنن أبي داود، النكاح ٤؛ قرطبي، أحكام القرآن ٢/٦٠.

# کەوتمە نێو چاڵی زیناوە زۆر پەشیمانم

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) کە یەکێکە لەو هاوەڵە بەرێزانەی بەردەوام لە خزمەتی پیغەمبەر خوا (صلى الله عليه وسلم) و پەیامەکەیدا بووە، بۆمان دەگێڕێتەوە:

ڕۆژێکیان لە مزگەوتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) دانیشتبووم کاتێك خانمێك هات و نزیکبووەوە، بە ڕوخساریدا دیاربوو کە خەمگین و دەردەدارە. بەشەرمەزارییەوە وتی:

- من زینام کرد و منداڵێکم بوو، لە ترساندا منداڵەکەمم کوشت تا کەس پێم نەزانێت، ئایا دەتوانم سەرەڕای ئەمە تەوبە بکەم؟

لەبەرامبەردا چەندە سەرسام بووم هێندەش تووڕە، وتم:

- چاوت ڕوون نەبێت و نەگەیت بە خێر، نەخێر ناتوانیت تەوبە بکەیت.

ژنەکە بە خەم و پەژارەیەکی زۆر و پەشیمانییەوە ڕۆیشت. کاتێك چووە دەرەوە بە هەموو دڵ و دەروونیەوە دەستی کرد بە پاڕانەوە لە خوای پەروەردگار و بەم شێوەیە پەژارەکەی هێنایە سەر زار:

- چەندە حەیفە! خوایە داخۆ ئەم جوانییەی منت بۆ ئاگری دۆزەخ دروستکردبوو!

بۆ ڕۆژی دواتر لە پاش ئەنجامدانی نوێژی بەیانی چوومە لای پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و باسی ئەو خانمەم بۆ کرد کە داوای فەتوای لێکردم. هەموو گفتوگۆکەی نێوانمانم بۆ گێڕایەوە، ئازیزمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی:

- چەند هەڵەت وتووە. تۆ هەرگیز ئەو ئایەتەت نەخوێندوەتەوە کە دەفەرموێت:

﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ﴾ (الفرقان: ٧٠)

مەگەر ئەو کەسەی تەوبە بکات و باوەڕ بهێنێت وکار وکردەوەی چاکە ئەنجام بدات. ئا ئەو جۆرە کەسانە خوا کار و کردەوە خراپەکانیشیان بۆ دەگۆڕێت بە چاکە.

## کۆڵان بە کۆڵان بەشوێن ژنەکەدا گەڕام!

هەستم کرد هەڵەیەکی گەورەم کردووە. بەخەمبارییەوە لە مزگەوت هاتمە دەرەوە، چوومە نێو کۆڵانەکانی مەدینە. یەك یەك هەموو ماڵەکان دەگەڕام و هەوڵم دەدا ژنەکە بدۆزمەوە. لە هیچ شوێنێك نەمدۆزییەوە. سەرەڕای گەڕانێکی زۆرم نەمتوانی بیدۆزمەوە. لەوە دەترسام ببمە هۆکارێك بۆ خراپەیەکی تر. بە خەم و ئەندێشەیەکی ئێجگار زۆرەوە گەڕامەوە.

بۆ ڕۆژی دواتر خانمەکە خۆی هاتەوە بۆ لام، دیاربوو زانیبووی من بە

دوایدا گەڕاوم. بە بینینی ئافرەتەکە گەشامەوە و خێرا گفتوگۆکەی نێوان خۆم و پێغەمبەری خوام وەك خۆی بۆ گێڕایەوە و ئەو ئایەتە پیرۆزەشم بۆ خوێندەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئاماژەی پێکرد. ئافرەتەکە لە خۆشیدا چاوەکانی دەدرەوشانەوە و شادی لە ڕوخساری دەباری وەك ئەوەی بارێکی قورس لەسەر شانی لابرابێت. هەتا بڵێیت خۆشحاڵ بوو.

- سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ڕێگای دەرچوونی بۆ من بەدیهێنا.

ئەمەی وت و بە شادییەکی بێوێنەوە سوژدەی برد. پاش ئەوە گەڕایەوە ماڵەوە و بۆ دەربڕینی سوپاسگوزارییەکەی بەندەکەیی ئازادکرد.[1]

١. تفسير إبن كثير، ٤٠٨/٣، ١٣٩/٦؛ سيوطي، الدر المنثور ٢٥٣/٦.

# خوای پەروەردگار دووهێندەی ئەوەی پێبەخشیم!

لە سەردەمی خەلافەتی حەزرەتی عومەردا (رضي الله عنه) گەنجێکی دیندار و لەخواترس هەبوو. ئەم گەنجە یەکێك بوو لەو موسڵمانانەی کە بەردەوام هاتوچۆی مزگەوتی دەکرد و زۆر بەگەرموگوڕی پەرستشەکانی بەجێ دەهێنا. لە کاتی نوێژخوێندندا بە خشوعێکی ناوازەوە سەری لە زەوی دەنا و، زەوییەکەی بە فرمێسکەکانی تەڕ دەکرد.

پاش ماوەیەك حەزرەتی عومەر (رضي الله عنه) هەستی کرد ئەم گەنجە پێی لە مزگەوت بڕیوە و چیدی لە ڕیزی نوێژخوێنانی مزگەوتدا دەرناکەوێت. پاش هەواڵپرسینی بۆی دەرکەوت گەنجەکە وەفاتی کردووە.

ئەم گەنجە بە جۆرێك لە جۆرەکان لە ڕێگای هاتوچۆی ماڵەوەیدا تووشی ئافرەتێکی نیازخراپ هاتبوو؛ ئافرەتەکە ویستبووی ئەو گەنجە بخاتە نێو داوی خۆیەوە.

لەو ساتەدا کە خەریکبوو گەنجەکە بکەوێتە نێو داوی ئەو ئافرەتەوە، لەناکاو هەستی کرد ئەم ئایەتە پیرۆزە کەوتووەتە سەر زاری:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ إِذَا مَسَّهُمْ طَٰٓئِفٌ مِّنَ ٱلشَّيْطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ ﴾ (الأعراف: ٢٠١)

بەڕاستی ئەوانەی کە پارێزکار و تەقوادار بوون، کاتێك خەتەرە و خەیاڵێك لە لایەن شەیتانەوە تووشیان دەبێت، ئەوە خێرا بێدار دەبنەوە و خوای خۆیان بیر دەکەوێتەوە و هۆشیار دەبنەوە، ئیتر دەستبەجێ بینادەبن و بەرچاویان ڕوون دەبێت (ڕێبازی ڕاست بەدی دەکەن و لێیان ناشێوێت).

ئەو تاسەیەی کە ئەم هەستە پێی دابوو، لەنێو هەستی شەرم بەڕووگیراندا دڵی دەوەستێنێت و لەوێدا دەکەوێت. کاتێك حەزرەتی عومەر (رضي الله عنه) بە هۆکاری مەرگی گەنجەکەی زانی ڕاستەوخۆ چوو بۆ ئەو شوێنەی لێی نێژرابوو، لەسەر گۆڕەکەی ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوێندەوە:

﴿ وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴾ (الرحمن: ٤٦)

"بۆ ئەو کەسەش لە مەقامی پەروەردگاری خۆی ترسابێت، دوو باخی ڕازاوە ئامادەیە"

پاش ئەوەی حەزرەتی عومەر وتەکانی تەواوکرد، بە شێوازێك هەمووان بیبیستن دەنگێك لە گۆڕەکەوە، بگرە لە جیهانی ماناوە وتی "ئەی ئەمیری باوەڕداران! خوای گەورە دووهێندەی ئەوەی پێبەخشیم کە تۆ باسی دەکەیت!"

# دیاره تۆ بوختانێکی گەورەت بۆ کچەکەم هەڵبەستووە!

ژینگە و هاوڕێی خراپ لە ڕێگەی بەگەڕخستنی هەستە خراپەکانەوە، مرۆڤ بەرەو هەڵە کێشدەکەن. هەڵە لەدوای هەڵەی پێ ئەنجام دەدەن و، دەبنە هۆکار بۆ پێداگریی ئەو کەسە لەسەر هەڵە. حەزرەتی عەلی (رضي الله عنه) دەفەرموێت:

"هاوڕێیەتیی کەسانی خراپ مەکە! چونکە ئەوان هەوڵ دەدەن خراپەکانی خۆیان جوان نیشانبدەن و، تۆش وەك خۆیان لێبکەن. گەر لەم جۆرە کەسانە دوور نەبیت، بە بێ ئەوەی هەست بکەیت ڕەوشتی ئەوان وەردەگریت. باش بزانە کە کاریگەریی هاوڕێکان بەتەنها لەسەر گوفتار و ڕەفتاری یەکدی نابێت، بەڵکو کار لە سیمای یەکتریش دەکەن. تەنانەت تەماشاکردنی سیماکانیش دەبێتە هۆکار بۆ هاتنەکایەی کاریگەریی بەرچاو لە مرۆڤەکاندا."[١]

ژینگەی هاوڕێی خراپ مرۆڤ بەرەو کردەوە خراپەکانی وەك دزی و زینا

---

١. المناوي، فيض القدير، ٥/٥٠٧.

کێشدەکات و لەگەڵ مەیخۆری و قومار و هەموو کردەوەیەکی زیانبەخشدا ڕایدەهێنێت.

ئەوەی لە سەردەمی نەزانیدا بەسەر "هیندی کچی عوتبەی دایکی حەزرەتی معاویە"دا هات، تەنها یەکێکە لەو ڕووداوانەی کە ڕۆژانە هەزاران هاوشێوەی بە هۆی ژینگەی خراپەوە دێتە ئاراوە.

"هیندی کچی عوتبە" یەکەم هاوسەرگیری لەگەڵ "حەفسی کوڕی موغیرە"دا ئەنجامدا کە لە هەمان کاتدا بە "فاکیهە"ش بانگ دەکرا یەکێك بوو لە ناودارانی مەککە و لەو گەنجانەی مەککە بوو کە ئالودەی ڕابواردن و کەیفسازی بوون. میوانخانەیەکی هەبوو کە لەگەڵ گەنجانی تری مەککەدا بەهاوبەشی بەکاریان دەهێنا. ئەو گەنجانەی کە نزیکی و تێکەڵاوییان زیاتر بوو بەبێ مۆڵەت خواستن هاتوچۆی ئەم میوانخانەیەیان دەکرد.

ڕۆژێکیان کەماڵەکە چۆڵ بوو، فاکیهە لەگەڵ هیندی خێزانیدا چوون بۆ ئەوێ. پاش بەسەربردنی کاتێکی خۆش، بە مەبەستی پشووی چێشتەنگاو پاڵیان دایەوە و خەویان لێکەوت. هیندی کچی عوتبە هێشتا لە خەودابوو کە فاکیهە هەستا و بە مەبەستی ڕاپەڕاندنی کارەکانی لە ماڵەکە دەرچوو و خێزانەکەی بەجێهێشت.

پاش ماوەیەك لە دەرچوونی ئەو، یەکێك لە گەنجانی مەککە هات بۆ ماڵەکە. وەك هەموو جارێك بەبێ مۆڵەتخواستن خۆی کرد بە ژووردا. کە بینی هیند لەوێدا بەتەنها نوستووە، حەپەسا. خێرا بێڕاوەستان لە دیوەخانەکە چووە دەرەوە و بەپەلە دوورکەوتەوە. کەمێك لەولای دیوەخانەکەوە لەگەڵ فاکیهەی کوڕی موغیرەدا یەکیان بینی.

## ملت بشکێنە، بڕۆرەوە بۆ ماڵی باوکت!

بە بینینی پیاوەکە خوێن بەرچاوی فاکیهەی گرت. دەربارەی هاوسەرەکەی هەزار بیری خراپ بە مێشکیدا هات و گومانی خراپی برد. بێ ئەوەی هیچ شتێك بە پیاوەکە بڵێت گەڕایەوە بۆ دیوەخانەکە و زللەیەکی توندی لە هاوسەرەکەی دا و نەڕاندی بەسەریدا و وتی:

- ئەوەی پێش کەمێك لێرە ڕۆیشت کێ بوو؟

هیندی کچی عوتبە بەحەپەساوی و سەرمەستیی خەوەوە و بێخەبەر لەوەی هاتووە و چووە دەستی بە شوێنی زللەکەوە گرت و وتی:

- من کەسم نەبینیوە. لێرە لەگەڵ تۆدا نوستبووین، ئێستا تۆ هاتیت و خەبەرت کردمەوە. دواتریش زللەت لێدام.

بەڵام مێردەکەی بڕوای بە قسەکانی نەکرد و وای دەزانی درۆ دەکات، هەر بۆیە بەتوڕەییەوە هاواری کرد:

- ملت بشکێنە، بڕۆرەوە بۆ ماڵی باوکت!

کاتێك هیند تێگەیشت کە بووەتە قوربانیی بوختانێك، هەموو شتێك کۆتایی هاتبوو. کە بۆی دەرکەوت ناتوانێت هیچ لە مێردەکەی بگەیەنێت، لەنێو خەم و پەژارەیەکی زۆردا ڕۆیشت. بەدەم هەنسکەوە گەڕایەوە بۆ ماڵی باوکی.

مێردەکەشی بەو توڕەییەوە چووە نێو خەڵك و بە بەدگومانییەوە بە شێوەیەك باسی ڕووداوەکانی ناو خەیاڵی کرد وەك ئەوەی ڕاستی بن.

قسە و قسەڵۆك لە ساتێکدا هەموو شاری تەنی. قسەکان گەیشتەوە بە گوێی عوتبەی باوکی هیند. ئەوەی بیستی ناخی وێرانکرد. دەستبەجێ هاوڕێکانی بەجێهێشت و گەڕایەوە بۆ ماڵەوە. عوتبە پیاوێکی دونیادیدە و

عاقڵ بوو. لەپێشدا قسەی لەگەڵ کچەکەیدا کرد و گوێی لەو گرت. تێگەیشت لەوەی چی بووە و چی ڕووی داوە. پاشان چوو زاواکەی دۆزییەوە، هێنایە پەنایەکەوە و پێی وت:

- بڕوانە کوڕەکەم! خەڵکی قسەی لابەلاتان لەبارەوە دەکەن. دیارە هەڵەتێگەیشتنێك ڕووی داوە. باشترە بەدواداچوونێکی باش بۆ ڕاستی بابەتەکە بکەین، گەر تۆ لەسەر حەق بیت و وەك تۆ دەڵێیت کابرا کارێکی وای ئەنجامدابێت، ئەوەی پێویستە دەیکەین و چیدی دەرفەت نادەینە خەڵکی قسەی لابەلا بکەن. گەر شتێکی واش ڕووی نەدابوو، دەچین بۆ لای یەکێك لە کاهینەکانی وڵاتی یەمەن تاوەکو بڕیار لەسەر بابەتەکە بدات.

## بوختان لانەیەك وێران دەکات

عوتبە و فاکیهە پێکەوە چوونە لای پیاوە گومانلێکراوەکە و داوایان کرد ڕاستیی ڕووداوەکەیان بۆ باسبکات. ئەویش سوێندی خوارد کە سەرلەبەری ئەو قسانە درۆن و دوورن لە ڕاستییەوە. پاش ئەمە عوتبە تووڕەبوو، ڕووی کردە زاواکەی و پێی وت:

- دیارە تۆ بوختانێکی گەورەت بۆ کچەکەم هەڵبەستووە. خۆت ئامادەبکە هەموو پێکەوە دەچینە لای کاهینەکانی یەمەن. پابەندی ئەو بڕیارەش دەبین کە ئەوان لە بارەمانەوە دەیدەن.

فاکیهە و دەستەیەك لە خێڵی 'کوڕانی مەخزوم" و عوتبەش لەگەڵ کچەکەی و چەند خانمێك لە خێڵی 'کوڕانی عەبدولمەناف"دا کە دڵنەواییان دەکرد، بەرەو یەمەن کەوتنە ڕێ. کاتێك لە شوێنی کاهینەکان نزیکبوونەوە

هیند وردەوردە ڕەنگی گۆڕا و سوورهەڵگەڕا، عوتبەش تەماشای کچەکەی کرد و وتی:

- دەبینم ڕەنگت گۆڕاوە و ناڕەحەت دیاریت. پێم وایە هۆکاری ئەمە ترست بێت لە ڕوودانی شتێکی نەخوازراو، چیتە؟

هیند کە خانمێکی ژیر بوو وتی:

- نەخێر سوێند بە خوا باوکە گیان! هۆکاری ئەم حاڵەم بوونی خراپەیەك نییە لە مندا، بەڵکو پەیوەندی بە دۆخی ئەو کەسانەوەیە کە بڕیارمان لە بارەوە دەدەن. هەردووکمان باش دەزانین کە مرۆڤەکان لە کاتی بڕیارداندا دەکرێت ڕاستی بپێکن، بەڵام ئەگەر هەیە بکەونە هەڵەشەوە. من لەوە دەترسم گەر کاهینەکان لە بڕیارەکەیاندا بکەونە هەڵەوە و لای عەرەبەکان سەرشۆڕتان بکەن.[1]

هەرچی بوو لە ئاکامدا بوختان لانەیەکی دیکەی پەرت و وێران کرد و بەداخەوە هەتا ئەمڕۆش هاوشێوەی ئەم جۆرە کارەساتانە هەر بەردەوامە.

١. الطبراني، المعجم الكبير، ٦٩/٢٥.

# براكەم، تۆ هەر بەڕاستی نموونەی پاکیزەییت!

گەنجێك هەبوو بە ناوی سولەیمانی کوڕی یاسر کە بە قۆزی و کەشخەیی بەناوبانگ بوو. لەبەر ئەم تایبەتمەندییەی بەردەوام جۆرەها تاقیکردنەوە دەهاتە سەر ڕێگای.

ڕۆژێکیان سولەیمان لەگەڵ هاوڕێیەکی نزیکیدا چوون بۆ گەشتێك. پاش ماوەیەك لە ڕێکردن، لە شوێنێکی سەر ڕێگا لایان دا. ئەوێ شارۆچکەیەکی بچووك بوو. هاوڕێکەی مۆڵەتی لە سولەیمان خواست و چوو تا شتێك بۆ خواردن بهێنێت.

کاتێك سولەیمان لە چاوەڕوانیی هاوڕێکەیدا بوو لە ماڵێکی بەرامبەرەوە ئافرەتێك بانگی کرد بۆ لای خۆی. سولەیمان بە بیرۆکەی ئەوەی "ئافرەتەکە شتێکی پێویست بێت"، چوو بەدەمیەوە.

- فەرموو بەڕێزم، چیتان ویست؟

ژنەکە نیازی خراپ بوو. پێی وت:

- هیچم ناوێت، تۆم دەوێت. لەماڵەوە تەنهام، دەی وەرە!

سولەیمان تێگەیشت کە دووچاری تاقیکردنەوەیەکی سەخت هاتووە. هەر بۆیە سەرزەنشتی ژنەکەی کرد و وتی:

- وەرەوە هۆش خۆت، لە خوا بترسە. تۆ دەتەوێت چی بکەیت!

لەبەرامبەر ئەم وەڵامە چاوەڕواننەکراوەدا ژنەکە پەنجەرەکەی داخست و چووەوە ژوورەوە.

## باشە، ئەی تۆ بۆچی دەگریت؟

سولەیمان لەژێر کاریگەریی ئەم ڕووداوەدا دەستی کرد بە گریان. لەم کاتەدا هاوڕێکەی گەڕایەوە. کاتێك ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە ئەم جارە هاوڕێکەی دەستی کرد بە گریان. سولەیمان بەسەرسامییەوە پرسی:

- ئەی تۆ بۆچی دەگریت؟

هاوڕێکەی بەدەم گریانەوە وتی:

- براکەم! تۆ بەڕاستی نموونەی پاکیزەیی و داوێنپاکیت. باش بوو من ڕووبەڕووی تاقیکردنەوەیەکی لەم شێوەیە نەبوومەوە. لەوانەبوو من نەمتوانیایە هەڵوێستم وەك تۆ بێت. خوا پەنامان بدات دەکرا لە تاقیکردنەوەیەکی لەو شێوەیەدا بکەوم. براکەم چەند سوپاسی خوا بکەیت هێشتا کەمە، چونکە خوا بە ئەندازەی جوانییەکەت هێزی ئیمانیشی پێبەخشیویت.

پاشان دوو هاوڕێکە لەوێ دوور دەکەونەوە و شەو لە کاروانسەرایەك لادەدەن بۆ پشوودان. سولەیمان شەو لە خەونیدا حەزرەتی یوسف دەبینێت. حەزرەتی یوسف پێی دەفەرموێت:

- وەرە با لە ئامێزت بگرم براکەم. جوانییش بە گوێرەی خۆی تاقیکردنەوەی هەیە. لەمەدا تۆش وەك من ڕووبەڕووی تاقیکردنەوە بوویتەوە، بەڵام سەرکەوتوو بوویت. پیرۆزباییت لێ دەکەم!

# چی بووە وا هەموو گیانت دەلەرزێت؟

لە سەردەمێك لەسەردەمەکاندا ژنێکی زۆر جوان و شۆخ و شەنگ هەبوو. بە جوانییەکەی کوڕانی لە خشتە دەبرد و بەرەو کاری خراپ هانی دەدان. بگرە ئەو ئەم کردەوە نابەجێیەی کردبووە پیشەی.

لەو شارەدا گەنجێك هەبوو کە پێشەنگی ڕەوشتبەرزی بوو. ڕۆژێك بە هەر هۆکارێك بێت ئەم گەنجە ڕێی دەکەوێتە لای ماڵی ئەو ئافرەتە. کاتێك بە بەردەم ماڵیاندا دەڕوات، لەناکاو چاوی دەکەوێتە سەر ئەو ئافرەتە. هەرچی دەکات بۆ ماوەیەك ناتوانێت چاوی لەسەر لا ببات. ژنەکەش وەڵامی نیگاکانی دەداتەوە و سەیری چاوی گەنجەکە دەکات.

پاشان کوڕە گەنجەکە خێرا ڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوە. چەندی دەکرد نەیدەتوانی ئەو ئافرەتە جوانە لە خەیاڵی خۆی دەربکات. سەیری هەرکوێی کردبا شەیتان سەرلەنوێ وێنەی ئەوی ئارایشت دەکردەوە و دەیهێنایەوە پێش چاوی. بڕیاری دا بە هەر نرخێك بووە بگات بەو ژنە.

ڕۆژی دواتر چوو بۆ لای ئافرەتەکە. هەموو پارە و کەلوپەلە بەنرخەکانی

لەگەڵ خۆیدا هێنا و دای بەو ئافرەتە. پێی وت کە دەیەوێت لەگەڵیدا بێت. ئافرەتەکەش ئەم داوایەی گەنجەکەی قەبووڵکرد. لەو ساتەدا کە کوڕە گەنجەکە دەستی بۆ ئافرەتەکە درێژ دەکرد، لەناکاو ترسی خوا کەوتە دڵی. دەنگێك لە ناخیدا پێی دەوت:

- تۆ ئەم هەموو ساڵە بەردەوام لە ڕەوشتبەرزی و پەرستش جودا نەبوویتەتەوە، ئێستا هاتوویت کەوتوویتەتە بەر قاپیی ئەم ئافرەتە خراپە؟ لە خوا ناترسیت؟ شەرم لە پێغەمبەر ناکەیت؟ خوای پەروەردگار ئەم حاڵە بەد و ناشرینەی تۆ نابینێت؟ دەستبەجێ وەرەوە هۆش خۆت!

گەنجەکە لەناکاو ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا و هەموو جەستەی دەلەرزی. ئافرەتەکە پرسی:

- چی بووە وا هەموو گیانت دەلەرزێت؟

گەنجەکە لە وەڵامدا وتی:

- ترسی خوا کەوتە ناخمەوە. ناتوانم ئەم کارە بکەم. من دەڕۆم، پارە و کەلوپەلەکانیش بۆ تۆ.

## پیاوە گەنجەکە لەتاو گوناهەکەی دەگریا

گەنجەکە بەدرێژایی ڕێگاکە بەدەم گریانەوە هاتەوە بۆ ماڵەوە. زۆر پەشیمان بوو لەو هەڵسوکەوتەی کە ئەنجامی دابوو. لە خوای گەورە دەپاڕایەوە و بەکوڵ داوای لێخۆشبوونی دەکرد.

دۆخی ئەم گەنجە کاری لەو ئافرەتە گوناهکارەش کرد و ترسێك کەوتە ناخیەوە. ئەویش بەگریانەوە وتی:

- هاوار بۆ حاڵی من، ئەو گەنجە یەکەمین گوناهی بوو. منیش هەموو تەمەنم بە گوناهەوە بەهەدەرچووە. مەگەر ئەو خوایەی کە ئەو لێی دەترسێت خوای منیش نییە؟ ئایا کۆتایی من بە کوێ دەگات؟

بەم شێوەیە بە ناڵە و هاوارەوە دەرگای ماڵەکەی داخست و نامێزی کرد بە تەوبەدا.

ماوەیەکی زۆر تێپەڕی. ژنەکە لە دڵی خۆیدا وتی:

- با بچم چاوێکم بەو زاتە بکەوێت کە بووە هۆکاری تەوبەکردنم. پرسیاری لە ناونیشانی ماڵی گەنجەکە کرد و دۆزییەوە. بەدرێژایی ڕێگاکە بیری لەوە دەکردەوە ئایا بە حەڵاڵی قەبووڵی دەکات یان نا، پڕبەدڵ تەمەننای ئەوەی دەکرد. بەدەم ئەو خەیاڵەوە گەیشتە بەردەرگای ماڵی گەنجەکە. خزمەتکارێك دەرگاکەی بۆ کردەوە و پێی ڕاگەیاند کە خاوەنماڵ لە ماڵەوەیە، ژنەکە وتی:

- بە نیەتێکی خێرەوە هاتووم. پێی بڵێن لوتف بنوێنێت و تا دەرگاکە بێت.

کاتێك گەنجەکە هاتە بەردەرگا و چاوی بەو ژنە کەوت کە لە خشتەی بردبوو، جەستەی کەوتە لەرزین. وتی ''الله''... پاشان دەستبەجێ کەوتە سەر زەوییەکە و گیانی سپارد.

بە بینینی ئەم دیمەنە ئافرەتەکە پەرێشانبوو و سەرزەنشتی خۆی دەکرد:

- ئەو لەبەر ئەوەی یەك جار نزیك بوویەوە لە شکاندنی تەوبەکەی، گیانی سپارد. کەچی تۆ ئەو هەموو جارە تەوبەت شکاندووە و بە خەیاڵیشتدا نایەت.

پاشان گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی و لەپاش ئەم ڕووداوەوە تەواوی ژیانی بە داوێنپاکی بەسەربرد.

# مۆڵەتم بدە بیری و هۆش لەسەر دەردەکەم!

لە سەردەمێکی زوودا ژنێك هەبوو بە جوانییەکەی بەناوبانگ بوو. ئەم ژنە زۆر دڵی بە جوانییەکەی خۆی خۆشکردبوو و شانازییەکی زۆریشی پێوە دەکرد. ڕۆژێك چووە بەردەم ئاوێنە، بەفیزەوە دانیشت و تەماشای جوانیی ڕوخساری خۆی دەکرد. ڕووی کردە مێردەکەی و پرسی:

- بڵێیت پیاوێك هەبێت ئەم ڕوخسارە جوانە ببینێت و بیر و هۆش لەدەست نەدات؟

مێردەکەشی وتی:

- بەڵێ هەیە.

ژنەکەش بە کەمێك گاڵتەپێکردن و مەراقەوە پرسی:

- کێ هەیە؟

مێردەکەشی باسی دادوەری شارەکەی بۆ کرد کە خواپەرستترین و پاکیزەترین پیاوی ئەو سەردەمە بوو و وتی:

- عوبەیدی کوڕی عومەیر.

ژنەکە بەلەخۆڕازیبوونەوە وتی:

- کەواتە مۆڵەتم بدە هۆش و بیری لەسەر دەردەکەم.

پیاوەکەش وتی:

- باشە، ئەوە مۆڵەتم دایت.

پاش وەرگرتنی ئەم مۆڵەتە ژنەکە بە بیانووی پرسیار و فەتوا وەرگرتن چوو بۆ لای دادوەرەکە.

عوبەیدی دادوەر وتی:

- فەرموون، گوێم لێتانە.

ژنەکەش لەم کاتەدا بۆ ئەوەی جوانییە ڕوون و دڵڕفێن و مانگ ئاساکەی دەربخات، ڕووپۆشەکەی لابرد. لەو سەردەمەدا تەنها کەنیزەکەکان ڕووپۆشیان لا دەدا، بۆیە عوبەیدی کوڕی عومەیر وتی:

- ئەی کەنیزەکی جێ درەخشانەوەی لوتفی جوانیی خوا! ڕووپۆشەکەت بدەرەوە بەسەر ڕووخسارتدا.

## وەڵامی پرسیارەکانم بدەرەوە!

ژنەکە دڵنیابوو کە دادوەرەکە مەیلی بە لایدا جوڵاوە، بەئاسوودەیی ئەوەوە کە بە ئامانجەکەی گەیشتووە، بۆی خستەڕوو کە ئارەزووی دەکات:

- من شەیدات بووم. دەمەوێت پێکەوەبین. ویستەکەم بهێنەرە جێ.

پاشان گفتوگۆیەکی لەم شێوەیە لەنێوانیاندا ڕووی دا و دادوەر وتی:

- هەندێك شتت لێ دەپرسم، گەر ڕاستی بڵێیت، ئەوکات دەتوانم داواکەت بهێنمە جێ.

ژنەکەش وتی:

- بێجگە لەو پرسیارانەی کە وەڵامەکەیان بەڵێ یان نەخێرە، پرسیاری ترم لێ مەکە!

- پێم بڵێ، ئەگەر ئێستا فریشتەی مەرگ بێت بۆ گیانکێشانت، دڵخۆش دەبیت گەر ئارەزووەکەت بهێنمە جێ؟

- نەخێر، هەرگیز!

- وەڵامەکەت ڕاست بوو. باشە ئەی پێت خۆش دەبێت گەر لەو کاتەدا کە لە گۆڕ دەنرێیت و فریشتەی "مونکەر و نەکیر" دێن بۆ پرسیارلێکردنت من داواکاری و ئارەزووەکەت قەبووڵ بکەم؟

- نەخێر، هەرگیز!

- ڕاستت وت. ئەی ئایا باشە پێت خۆش دەبێت لەو کاتەدا داواکارییەکەت جێبەجێ بکەم کە دەفتەرەکان تەسلیمی مرۆڤەکان دەکرێنەوە و هێشتا نازانیت ئایا دەفتەرەکە دەدرێتە دەستی چەپ یاخود ڕاستت؟

- نەخێر، هەرگیز!

- ڕاستت وت. باشە، پێت خۆش دەبێت گەر ئەم داوایەت لەو کاتەدا جێبەجێ بکەم کە تەرازووی کێشانی کردەوەکان دادەنرێت و تۆ هێشتا نازانیت کردەوە چاکەکانت قورس دەبن یان خراپەکان؟

- نەخێر، سوێند بە خوا نەخێر!

- ڕاستت وت. ئەی ئایا باشە دڵخۆش دەبیت لەو کاتەدا داواکەت بهێنمە جێ کە لە سیرات دەپەڕیتەوە و هێشتا دڵنیا نیت ئایا دەتوانیت بپەڕیتەوە یاخود نا؟

- نەخێر، هەرگیز!

- ڕاستت وت. ئەی پێت خۆش دەبێت لەو ساتەدا کە تۆ لەبەردەم خوادا لێپرسینەوەت لەگەڵدا دەکرێت، من بێم و داواکارییەکەت بەجێ بهێنم؟

- نەخێر، هەرگیز!

- ئەی کەنیزەکی بەندەی خوا. لە خوا بترسە! بەڕاستی خوا زۆر شتی بە تۆ بەخشیوە، نیعمەی جوانی و چەندین نیعمەتی تری بە سەردا ڕژاندوویت...

پاش ئەم گفتوگۆیە ژنەکە ڕۆیشتەوە بۆ لای مێردەکەی. مێردەکەی لێی پرسی:

- چی بوو؟ چیت کرد؟

ژنەکە وتی:

- من و تۆ لەسەر ڕێگایەکی هەڵەین! دوو کەسی خراپەکارین کە فیتنە و خراپەکاری دەنێینەوە.

بەم شێوەیە ژنەکە پەشیمانبووەوە و تەوبەی کرد و خۆی بۆ پەرستش و نوێژ و ڕۆژوو یەکلاکردەوە.[1]

---

١. ابن جوزي، ذم الهوى، ص. ٢٥٦-٢٦٦؛ الحازمي، الأجوبة المسكتة، ١/٢٦٥-٢٦٦.

# چوار کەس هەن کە شایەتحاڵی ئەو کردەوەیەی ئێمەن!

لە سەردەمانێکی زوودا زاتێکی بەتەمەنی زانا و ژیر هەبوو کە بە زانستەکەی کارا بوو. بە حاڵی خۆیەوە دەژیا و بەردەوام هەوڵی دەدا ڕاستی نیشانی خەڵك بدات.

ڕۆژێکیان کاتێك لەماڵ دەردەچوو. کوڕ و کچێکی گەنجی بینی کە لە سوچێکی کۆڵانەکەدا خۆیان حەشاردابوو.

کوڕەکە بە کچەکەی دەوت:

- گەر لەگەڵمدا بێیت، هێندە پارەت پێدەدەم.

کچەکە داوای کوڕەکەی قەبووڵکرد و بڕیاریدا لەگەڵیدا بڕوات. لەو کاتەدا پیاوە بەتەمەنەکە لە کچەکە نزیکبووەوە و پێی وت:

- لەگەڵ ئەودا مەڕۆ! گەر لەگەڵ مندا بێیت هێندەت پارە پێدەدەم.

پیاوە بەتەمەنەکە پێشنیاری بڕێکی زۆر زیاتری بۆ کچەکە کرد.

## دووانیان لەسەر شانی تۆن و دووانیشیان لەسەر شانی منن!

پاش ئەوە کچەکە بڕیارەکەی گۆڕی و وازی لە گەنجەکە هێنا و بڕیاری دا لەگەڵ پیاوە بەتەمەنەکەدا بڕوات. هەردووکیان پێکەوە ڕۆیشتن بۆ ماڵی پیاوە بەتەمەنەکە. پیاوە داناکە پرسی:

- گەر مرۆڤێك کردەوەیەکی خراپ ئەنجام بدات و، دوو شایەتیش ئەمە ببینن حاڵی ئەو کەسە چی بەسەر دێت؟

کچەکەش وتی:

- بێگومان سزا دەدرێت.

- ئەی ئەگەر بینەرەکان دووان نەبوون، بەڵکو چوار کەس بینییان چی دەبێت؟

- ئەوکات سزا وەرگرتنەکەی دڵنیاتر دەبێت.

پاش ئەم وەڵامە، پیاوە بە تەمەنەکە وتی:

- ئێمە ئێستا لێرەین. چوار کەس هەن کە دەبنە شایەت بەسەر ئەو کارەوە کە ئێمە ئەنجامی دەدەین.

کچە گەنجەکە کە گوێی لەم قسەیە بوو لە ترساندا لە شوێنی خۆی هەستا و وای زانی چوار کەس لەو ژوورەدا ئامادەیە و وتی:

- کوان؟ لە کوێدان؟

- دووانیان لەسەر شانی تۆن و، دووانیشیان لەسەر شانی منن و دەمانبینن. ئەوەش کە دادگاکە بەڕێوە دەبات خوای تەعالا خۆیەتی! پێت وایە لەم بارودۆخەدا تاوانبارەکان لە سزا دەربازیان ببێت؟ ئەوکات بۆچی ئێمە کارێکی لەو جۆرە ئەنجام بدەین؟

کچەکەیش لەبەرامبەر ئەم قسانەی پیرەمێردەکەدا زۆر شەرمەزار و پەشیمان بوو، لەژێر کاریگەریی ئەم قسانەی زاتە بەتەمەنەکەدا هەستی بەو کردەوە هەڵەیەی خۆی کرد و تەوبەی کرد.

# بۆچی پیاوە گەنجەکە پەنجەی خۆی لەسەر گڕی مۆمەکە ڕادەگرت؟

یەکێکی دیکە لەو کەڵەپیاوانەی کە تەمەنی لاویی خۆی بۆ خواپەرستی تەرخانکردبوو و، خۆی لە هەموو هەوا و ئارەزووە خراپەکانی نەفس پاراستبوو، موحەممەدی کوڕی سولەیمانە کە نووسەری شاکاری "مجمع الأنهر"ە.

موحەممەدی کوڕی سولەیمان لە نیوەشەوێکی سەردەمی خوێندنیدا بەشەو تا درەنگ لەژێر ڕووناکیی مۆمدا خەریکی موتاڵا و وانەخوێندن دەبێت. جارێکیان کاتێك سەرقاڵی موتاڵای زانستی دەبێت، کەسێك لە دەرگاکەی دەدات. لەو کاتەدا بەو سەرسامییەوە کە هاتنی کەسێك لە درەنگانی شەودا دروستی دەکات دەرگاکە دەکاتەوە. دەبینێت لەبەرامبەریدا کچێکی پێکەوتوو وەستاوە. میوانەکە پێی دەڵێت کە ڕێی بزرکردووە و لەبەر ئەوەی لەو چواردەورەشدا ڕووناکییەکی تری بەدی نەکردووە، ناچاربووە لە دەرگای ئەم بدات.

قوتابییە لاوەکە هەرچی بیردەکاتەوە ناتوانێت میوانەکەی ڕەتبکاتەوە، خۆ ناکرێت لە تاریکیی شەو و سارد و سەرمای شەقامەکاندا کچێکی

بێچارە جێبهێڵێت، بەناچاری فەرمووی هاتنە ژوورەوەی لێ دەکات. پاش ئەوەی سوچێکی نیشان دەدات تا تیایدا دابنیشێت و بحەوێتەوە، خۆشی تا بەرەبەیان بەردەوام دەبێت لە وانە خوێندن و کۆششکردنەکەی. کچە داماوەکە کە بە نیگای شەرماوی و بەدزییەوە سەرنجی ئەم گەنجە دەدات، دۆخێکی گەنجەکە زۆر سەرسامی دەکات، گەنجەکە جاروبار بۆ ماوەیەك پەنجەی لەسەر ئەو مۆمە ڕادەگرت کە لەبەر دەستیدا بوو و پاشان پەنجەی دەگێڕایە دواوە. گەنجەکە تا بەیانی ئەم جوڵەیەی چەندین جار دووبارەکردەوە. هەتا ئەوەی ڕۆژبووەوە.

پاش خۆرهەڵهاتن کچە گەنجەکە ئەوێ جێدەهێڵێت و ڕێیماڵەوە دەگرێتە بەر. دەگاتەوە ماڵی خۆیان، ماڵەکەیان کۆشکی یەکێك لە وەزیرەکانی ئەو سەردەمەیە، کچەکە خۆشی کچی ئەو وەزیرەیە. خەڵکی کۆشك بەمەراقەوە لێی دەپرسن چۆن و لەکوێ شەوی ڕابردووی بەسەربردووە، لەبەر ئەوەی بەدرێژایی شەو بە دوایدا گەڕاون و نەیاندۆزیوەتەوە. کچە گەنجەکەش هەموو ئەو شتانە یەك یەك دەگێڕێتەوە کە شەوی ڕابردوو بەسەریدا هاتوون، بەتایبەتیش دۆخی سەرسامکەری ئەو گەنجەی کە میوانداریی کردبوو. وەزیرەکە ئەو گەنجە بانگهێشتی کۆشکەکەی دەکات کە هاوکاریی کچەکەی کردووە و لێی دەپرسێت بۆچی بەدرێژایی شەو پەنجەی بەو شێوەیە لەسەر گڕی مۆمەکە داناوە. گەنجە جوانڕوخسارەکەش دەڵێت "نەمدەتوانی میوانێك لە دەرەوە بەجێ بهێڵم کە ڕێی ونکردووە و هانای بۆ من هێناوە، لەبەر ئەمە ئەوم هێنایە ژوورە بچووکەکەمەوە. بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی تەڵەکانی نەفسیشم، جار جار پەنجەم دەخستە سەر ئاگری مۆمەکە کە ئاگری دۆزەخی وەبیر دەهێنامەوە. کاتێك شەیتان دەیویست هەڵم بخەڵەتێنێت، بە دانانی پەنجەم

لەسەر ئاگرەکە، سزای دۆزەخم وەبیر نەفسم دەهێنایەوە و بەو شێوەیە خوا پاراستمی لە ئەنجامدانی کردەوەیەکی نادروست.“

## لاوێتیت لە چیدا بەسەربرد؟!

ڕەنگە هەندێك جار ئەوانەی کە لاوێتییان لە پەرستشدا بەسەردەبەن، بکەونە نێو گوناهێکەوە. بەڵام دەبێت لاوێکی وەها دەستبەجێ لەبەرامبەر ئەو گوناهەدا هەڵوێست وەربگرێت، خێرا بەرماڵەکەی بهێنێت، دەرفەتی ژیان نەداتە گوناهـ و، بە تەوبە و نوێژ و ڕۆژوو و بەخشین بەدوای ڕێگاکانی پاکبوونەوەدا بگەڕێت.

چونکە ساڵەکانی گەنجێتی لە دیدگای پەروەردگاردا زۆر گرنگن. پێغەمبەری خواش (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی ”لە ڕۆژی لێپرسینەوەدا مرۆڤ ناتوانێت بڕوات هەتا لێپرسینەوەی چۆنێتی بەسەربردنی ساڵانی لاوێتی تەمەنی لەگەڵدا یەکلا نەکرێتەوە.“

# گرنگ ئەوەیە بتوانیت
# لەناو شاردا خۆپارێز بیت

لە سەردەمانێکدا دوو برا هەبوون ناویان سەلمان و سولەیمان بوو. هەردووکیان لە دۆستانی خوا بوون. سەلمان لە شار و سولەیمانیش لە لادێ دەژیا. سولەیمان بۆ بەدووربوونی لە گوناهی شار، ژیانی لادێی هەڵبژاردبوو و دەیوت:

- لەم سەردەمەدا ژیان لە شار تا بڵێیت سەختە. من لە کەشی گوناهاوی ئەوێدا ڕێم بزر دەکەم. باشترین شت ئەوەیە لێرە و دوور لە مرۆڤەکان بە پیشەی شوانییەوە سەرقاڵ ببم و لە خوای خۆم نزیك بم.

سەلمانیش لە ناوەندی شاردا دوکانێکی پینەچێتی هەبوو و لەم ڕێگایەوە بژێویی خۆی پەیدا دەکرد.

سولەیمان لە لادێکەیدا ئاژەڵەکانی دەلەوەڕاند و، ناخ و چاوی لە حەرام و دیمەنە حەرامەکان بەدوور دەگرت و، بەردەوام بە ویرد و بیرکردنەوە و سوپاس و ستایشکردنی خواوە سەرقاڵ دەبوو. هەربۆیە لایەنی ڕۆحی و مەعنەویی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەرەوپێش دەچوو.

ڕۆژێکیان بیری لە سەلمانی برای کردەوە و لەخەیاڵی خۆیدا دەیوت:

- حەیف بۆ براکەم، لەو شارەدا لە دەریای گوناهدایە، ڕەنگە تەماشاکردنی دیمەنی حەرام هۆشی لە لا نەهێشتبێت. باشترە من سەردانێکی بکەم و ئەحواڵێکی بپرسم.

## کڕیارێکی ئافرەت دێت بۆ دوکانەکە

سولەیمان هەندێك لە شیری مەڕەکانی دۆشی و کردییە ناو مەتارەیەکەوە و دەمەکەی بەست، پاشان ڕێگای شاری گرتە بەر. کاتێك گەیشتە دوکانی براکەی، سەلمان دەم بە زیکر سەرقاڵی چاککردنەوەی پێڵاو بوو. کە یەکتریان بینی باوەشیان بە یەکدیدا کرد.

سولەیمان مەتارە پڕ لە شیرەکەی بە پەتێکەوە بەستەوە کە لە سەقفی دوکانەکەوە شۆڕبووبوویەوە و لەگەڵ براکەیدا دانیشت تا کەمێك تاسەی دووری بشکێنن.

لەم ساتەدا کڕیارێکی ئافرەت هات بۆ دوکانەکە. هەر کە پێی نایە نێو دوکانەکەوە بە بۆن و بەرام و لەش و لاری هۆشی سولەیمانی تەماوی کرد.

- کاك سەلمان دەتوانیت ئەو پێڵاوانەم بۆ چاك بکەیتەوە؟

- ئینشائەڵڵا بەسەر چاو، فەرموو کەمێك چاوەڕێ بکەن.

پاش ئەوەی چاککردنەوەی پێڵاوەکە تەواوبووبوو. ژنەکە پێڵاوەکانی لەپێکرد و ڕۆیشت. لەم سەروبەندەدا شتێکی سەیر ڕوویدا. لە سەقفەکەوە شتێك دەستی کرد بە تکەکردن بۆسەر مێزی پینەکردنەکە. کاتێك سەریان هەڵبڕی بینییان دڵۆپەی شیری ناو مەتارەکەیە کە سولەیمان لە لادێوە هێنابووی.

## بوونە وەلی لە دەشت و دەردا ئاسانە!

پاش ئەمە سەلمان بە براکەی وت:

- براکەم! بە هەڵهاتن لە مرۆڤەکان و ڕووکردنە دەشت و دەر گەیشتن بە پلەی وەلی ئاسانە. گرنگ ئەوەیە لەناو مرۆڤەکاندا بتوانیت ببیتە وەلی. ئێستا لە جیاوازییەکە تێگەیشتیت؟

- بەخوا نازانم چی بڵێم. ڕاست دەکەیت براکەم. من پێنج خولەك بەرگەی ئەو دیمەنەم نەگرت. بێگومان ئەم دیمەنانە ڕێگرن لەبەردەم بەرزبوونەوەی مەعنەوی تۆدا. هەر بۆیە نزمبوونەوەت بە خۆوە دیوە.

- لە کوێوە زانیت نزمبوونەوەم بە خۆوە دیوە؟

- تەماشاکە، من لای تۆ بە یەك سات کەوتم. تۆش هەموو ڕۆژێك لەگەڵ ئەمانەدا ڕووبەڕوویت و چاوت لەسەریانە. نیدی مەگەر دەکرێت نەکەویت؟

- منیش دەمەوێت ئەوە بڵێم سولەیمان. بابەتە گرنگەکە ئەوەیە لەناو ئەمانەدا خۆپارێزبیت. سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگارم من تا ئێستا خۆم پاراستووە و پشت بە خوا لەمەودواش خۆم دەپارێزم.

- چۆن دەکرێت ئەو دیمەنەی لەپڕ منی لەو پلە ڕۆحییەوە دابەزاند، هەموو ڕۆژێك تۆ نزم نەکاتەوە؟ تۆ لەمێژە کەوتوویت و بە خۆت نەزانیوە.

سەلمان زەردەخەنەیەکی نەرمی کرد و هەستایە سەرپێ، پەنجەی شایەتومانی بە سەری زمانی تەڕکرد و وتی "بسم الله"، پاشان لەسەر کونی مەتارە شیرەکە داینا، لەپڕ شیرەکە وەستایەوە و چیتر نەتکا.

دوو براکە تەماشای یەکتریان کرد. ئەم جارە نۆرەی سولەیمان بوو قسە بکات:

- تۆ ڕاست دەکەیت براکەم! ئەوەی سەخت و دژوارە ژیانی دوور لە مرۆڤەکان نییە، بەڵکو تێکەڵبوونە بە مرۆڤەکان و خۆپاراستنە لەتاوان لەنێو ئەواندا...

ئێوە ڕاتان چییە؟ چوونە دەر و دەشت و چیا باشترە؟ یان خۆپاراستنمان لەناو شاردا؟

# پاکیزەیی بەدیعوزەمان چۆن بوو؟

یەکێك لە گەورەترین تابلۆکانی پاکیزەیی سەردەمەکەمان بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسییە. وەرن پێکەوە چاوێك بە "پاشبەندی ئەمیرداغ"دا بخشێنین و لە زاری خۆیەوە گوێبیستی ئەم داستانی پاکیزەییە ببین:

ئاشکرایە لای ئەوانەی کە شارەزای ژیانمن. پەنجا و پێنج ساڵ لەمەوپێش کاتێك من لە تەمەنی بیست ساڵاندا بووم، بۆ ماوەی دوو ساڵ لە ماڵی پارێزگاری بەدلیس -خوا لێی خۆشبێت- عومەر پاشادا لەسەر پێداگریی و بەهۆی ڕێزی زۆری بۆ زانست مامەوە. ئەو شەش دانە کچی هەبوو، سیانیان گەورە و سیانیان بچووك. من سەرەڕای دووساڵ مانەوەم لە هەمان ماڵدا، سیانە گەورەکەیانم لێك جودا نەدەکردەوە و باشم نەدەناسینەوە. چونکە هیچ سەرنجم نەدابوون تا بتوانم ئەو کارە بکەم.

تەنانەت میوانێکم کە یەکێکبوو لە زانایان هاتە لام، لە دوو ڕۆژدا لێکی جودا دەکردنەوە و ناسینی. هەمووان و منیش سەرمان لەم حاڵە سووڕمابوو. لە منیان پرسی ''بۆ تەماشا ناکەیت؟''

دەموت:

"پارێزگاریکردن لە شکۆی زانست ڕێگام نادات تەماشا بکەم."

لێرەدا دوو بابەت هەن کە جێی سەرنجن. یەکەمیان ئەوەیە کە ئەم ڕووداوە لە سالآنی گەنجێتیی مامۆستادا ڕووی داوە. بە لای هەموانەوە بیستەکانی تەمەن ئەو قۆناغەیە کە زالبوون بەسەر هەوا و ئارەزووەکانی نەفس تیایدا لە هەموو قۆناغەکانی دیکەی تەمەن دژوارترە. بەلآم دەبینین سەرەڕای ئەوەش مامۆستا لەمەڕ پاکیزەیی خۆی زۆر هەستیارانە مامەڵەی کردووە.

## شکۆی زانست ڕێگریم لێ دەکات.

دووەم تایبەتمەندیی گرنگ بریتییە لەوەی: کاتێك لێی دەپرسن "بۆ تەماشا ناکەیت؟" بە وەلآمەکانی وەك "گوناهە، قەدەغەیە، خوا حەرامی کردووە؛ من مرۆڤێکی وریام ناتوانم تەماشا بکەم" وەلآم ناداتەوە، بەڵکو دەڵێت "شکۆی زانست ڕێگریم لێ دەکات."

واتە بابەتەکە نابەستێتەوە بەخۆی و ژیانی هەستیاریی خۆی و وریابوونییەوە. ئەمەش لەپاڵ پاکداوێنی و پاکیزەییەکەیدا دەرخەری خاکیبوونییەتی.

دیسان مامۆستا لە هەمان شاکاردا بەم شێوەیە باسی ڕووداوێکی ترمان بۆ دەکات:

"دیسان لە یەکێك لەو ڕۆژانەدا کە لە ئیستانبوڵ بووم، لە ناوچەی کاغتخانە(کاغەزخانە)ی ئەو شارەدا فیستیڤاڵ سازدەکرا. کاتێك پێکەوە لەگەڵ هەردوو خوالێخۆشبوو و پەرلەمانتار مەلا سەید تەها و سەید حاجی ئیلیاسدا بە بەلەم بەرەو کاغتخانە دەڕۆیشتین، لە هەردوو لای خەلیجدا

هەزاران ئافرەت و کچی پۆشاك نادروست و ناپۆشتەی ڕۆم و ئەرمەنی و ئیستانبوڵی هەبوون. ئێمەش لەپاڵ ئەو ئافرەتانەوە ڕەت دەبووین. بەدرێژایی ئەو گەشتە یەك کاژێرییە، مەلا تەها و حاجی ئیلیاس بڕیاریان داوە من بخەنە ژێر چاودێری و تاقیکردنەوە و بەسەرە چاویان لەسەر من بووە. بەبێ ئەوەی خۆم ئاگام لێبێت. لە کۆتایی گەشتەکەدا دانیان پێدانا و وتیان:

"سەرمان لەم حاڵەی تۆ سوڕما، هیچ تەماشات نەکرد."

وتم "لەبەر ئەوەی سەرەنجامی چێژە ناپێویست و کاتی و پڕ گوناهەکان ئازار و ئاخ هەڵکێشانە، نامەوێن."

ئەمانە دوو ڕووداوی گرنگ بوون لە ژیانی مامۆستا بەدیعوززەماندا کە دەرخەری پاکیزەیی و ژیانی هەستیارانەی ئەون.

# براکەتان تووشی فیتنەیەک هاتووە، نزای بۆ بکەن!

لەپاڵ باڵەخانەیەکدا لەنێو کوختێکی بچووکدا دەمایەوە. لەبەر ئەوەی کوخەکە ئاوی تێدا نەبوو، لە کانییەك ئاوی دەهێنا. یەکێك لە دانیشتووانی باڵەخانەکەی دراوسێ، لە کاتی هاتوچۆیدا وازی لێ نەدەهێنا و بە ڕوانینی بانگهێشتکەر لێی دەڕوانی. ئەویش لە هەموو جارێکدا سەری دادەخست و لێی دوور دەکەوتەوە.

ڕۆژێکیان دیسان وەك هەموو جارێك، بۆ دەستنوێژشوشتن چووە سەر کانییەکە. جامەکەی لە ئاوی کانییەکە نزیککردەوە. بەڵام لەو ساتەدا ڕووبەڕووی شتێکی چاوەڕواننەکراو بووەوە: دیواری مەڕمەڕی کانییەکە وەك پەردەی سینەما لەبەر چاویدا شەقبوو و کرایەوە. مامۆستا بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی و قوتابییەکانی چواردەوری بینی. مامۆستا وانەی "مەسنەوی نووری"ی بە قوتابییەکانی دەوت،

ئەویش گوێبیستی دەنگیان بوو. بیستی مامۆستا بە قوتابییەکانی دەڵێت:

- فڵان براتان دووچاری فیتنەیەك هاتووە، نزای بۆ بکەن.

## لەپاش هەموو نوێژێکی فەرزەوە ئەمە بخوێنەوە!

هەستی شەرمەزاری سەرتاپای جەستەی گرتەوە. لەدڵی خۆیدا دەیوت مامۆستا و قوتابیەکانی لە ئیسپارتەوە بە دۆخی من و ئەو ژنەیان زانیوە. ئیدی نەیدەتوانی لەو کوختەدا بەردەوامی بە ژیانی بدات. هەموو کەلوپەلەکانی کۆکردەوە و هات بۆ ئەو خانووەی شەقامی کیرازلێ مەسجیدی ئیستانبوڵ کە لەو ڕۆژانەدا مامۆستا بەدیعوززەمانی لێ دەمایەوە.

ماوەی سێ ڕۆژ لە لای مامۆستا مایەوە. مامۆستا بە هیچ جۆرێك باسی ئەو بابەتەی لەگەڵدا نەکرد. ئەو قوتابییانەێ کە لە لاشی بوون هیچیان نەوت. لە کۆتایی ڕۆژی سێهەمدا یەکێك لە قوتابییەکانی مامۆستا شوێنێکی لە نامیلکەی "جوشن الکبیر" کردەوە و مامۆستاش نزایەکی لەو شوێنەدا دەستنیشانکرد کە ئەو کردبوویەوە و وتی:

- لەپاش هەموو نوێژێکی فەرز ئەمە بخوێنەرەوە.[1]

إِلٰهِي! اَلذُّنُوبُ أَخْرَسَتْنِي وَكَثْرَةُ الْمَعَاصِي أَخْجَلَتْنِي وَشِدَّةُ الْغَفْلَةِ أَخْفَتَتْ صَوْتِي، فَأَدُقُّ بَابَ رَحْمَتِكَ وَأُنَادِي فِي بَابِ مَغْفِرَتِكَ بِصَوْتِ سَيِّدِي وَسَنَدِي الشَّيْخِ عَبْدِالْقَادِرِ الْكَيْلَانِيِّ وَنِدائِهِ المَقْبُولِ الْمأْنُوسِ عِنْدَ الْبَوَّابِ بِيَا مَنْ وَسِعَتْ رَحْمَتُهُ كُلَّ شَيْءٍ وَيَا مَنْ بِيَدِه مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَيَا مَنْ لَا يَضُرُّهُ

١. سەعید دەمیرتاش، لە کتێبی İffet Yaşayanlar (ئەوانەی پاکیزەییان لە ژیانیاندا ڕەنگ پێداوەتەوە).

شَيْءٍ وَلَا يَنْفَعُهُ شَيْءٍ وَلَا يَغْلِبُهُ شَيْءٍ وَلَا يَعْزُبُ عَنْهُ شَيْءٍ وَلَا يَؤُودُهُ شَيْءٍ وَلَا يَسْتَعِينُ بِشَيْءٍ وَلَا يُشْغِلُهُ شَيْءٌ عَنْ شَيْءٍ وَلَا يُشْبِهُهُ شَيْءٌ وَلَا يُعْجِزُهُ شَيْءٌ اِغْفِرْ لِي كُلَّ شَيْءٍ حَتَّى لَا تَسْئَلَنِى مِنْ شَيْءٍ.

واتا:

پەروەردگارا! گوناهەکان قوفڵیان لە زارم دا، زۆری و زەبەندەیی یاخیبوونەکان پشتیان چەماندمەوە، شەرمەزاریان کردم. پەردە ئەستوور و خنکێنەرەکانی بێئاگایی دەنگیان لێ بڕیم. بەڵام من دیسان هاتمە بەر قاپیی ڕەحمەتی تۆ، (نەك بە حاڵی ئالوودەیی گوناهەوە)، بەڵکو بە دەنگ و هەناسەی شێخ عەبدولقادری گەیلانییەوە کە لە قاتی حەقدا مەقبوولە و دەرگاوانەکان پێی ئاشنان، لە دەرگای لێخۆشبوونی تۆ دەدەم!

ئەی ئەو کەسەی ڕەحمەتەکەی دەوری هەموو شتێکی داوە! ئەی ئەو کەسەی جڵەوی هەموو شتێکی بە دەستە و، کلیلی هەموو شتێکی لایە! ئەی ئەو کەسەی کەس ناتوانێت زیانی یان سوودی پێ بگەیەنێت و لێی بەرزتر بێت.. ئەو کەسەی هیچ شتێك لە زانستی بەدەر نابێت.. پاراستن و چاودێریکردنی هیچ شتێکی بە لاوە سەخت نییە.. ئاتاجی هاوکاری هیچ شتێك نییە.. هیچ شتێك دەستی ناگرێت و سەرقاڵی ناکات.. هیچ شتێك لە خۆی ناچێت.. هیچ شتێك ناتوانێت بێهێزی بکات (پەروەردگاری مەزنم، خوایە گیان!) بە شێوازێك بەرپرسم نەکەیت لە هیچ کام لەو شتانەی ئەنجامم داوە، لێم خۆش ببە...

# ”ژنت بۆ دەهێنین،
# ئەمە ئاهەنگی تۆیە!..“

ئەو ڕۆژەی مامۆستا فەتحوڵڵا گولەن قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، خێزانەکەی وەك دەربڕینی سوپاسگوزاریی خۆیان بەرامبەر خوا، سەرجەم دانیشتووانی گوندیان بانگهێشتکرد و خوانیان پێدان. ئەو کاتە مامۆستا هێندەی ئەوەی بەتەواوی لە شتەکان تێنەگات تەمەنی کەم بوو، کاتێك بە چاوی پڕ مەراقەوە تەماشای ئەوانەی دەکرد کە دەهاتن و دەچوون و هەوڵی دەدا واتا بە ستایش و نزاکانیان بدات، گوێی لێبوو دایکی خوالێخۆشبووی وتی ”ژنت بۆ دەهێنین؛ ئەمە ئاهەنگی تۆیە!“

بە هۆی پەروەردەبوونی لە ژینگەیەکی لێوانلێو لە قووڵی حەیا و پاکیزەیی و شکۆدا، کە ئەم قسەیەی بیست شەرم سەرلەبەر دایگرت.

جا پێش ئەوەی تێپەڕین با ئەم ڕووداوەش لەمەڕ پاکیزەیی مامۆستا بگێڕینەوە:

سەردەمانێك مامۆستا لە تاقی یەکێك لە پەنجەرەکانی مزگەوتی

"ئوچ شەرەفلی"دا دەژیا و هەموو شەو و ڕۆژ لەوێ بوو. لە مزگەوتەکەدا وانەی فەرموودەی دەوتەوە و هەوڵی دەدا باسی حەق و حەقیقەت بۆ هەموو ئەوانە بکات کە لە چینە جیاجیاکانی کۆمەڵگاوە دەهاتن گوێی لێ بگرن. یەکێك لەو چینانەش کە وانەیان هەبوو، خانمان بوون.

لەنێو ئەو خانمانەدا یەکێك هەبوو بە ناوی "خاتوو خەیریە" کە ئافرەتێکی بەتەمەن بوو. ئەم خانمە ڕۆڵی دایکایەتی بۆ مامۆستا دەبینی و وەك چاوەکانی خۆی پارێزگاریی لێی دەکرد، لەگەڵ ئەو خانمانەدا دەبوو کە دەهاتن بۆ وانەکانی مامۆستا و دوای تەاوبوونی وانەکانیش تا مزگەوت بەتەواوەتی چۆڵ نەبووایە نەدەڕۆشت.

ڕۆژێکیان، پاش ئەوەی مامۆستا وانەی فەرموودەی تەواوکرد و خەریکبوو دەگەڕایەوە بەرەو ماڵە خنجیلانەکەی خۆی، هەستی کرد یەکێك بانگی دەکات. خانمێکی گەنج بوو کە چاوەڕێی چۆڵبوونی مزگەوتی کردبوو و دەیویست قسەی لەگەڵدا بکات.

مامۆستا پێی وت لە ناو کۆمەڵ یان لەگەڵ خاتوو خەیرییەدا پرسیارەکانی بکات و پاشان ویستی بەرەو تاقەکەی خۆی بڕوات. بەڵام خاتونەکە سووربوو لەسەر ئەوەی بەتایبەتی قسەی لەگەڵدا بکات.

## کەیفی خۆتە! بۆ خۆت لەم پەرێشانییەدا بمێنەرەوە!

پاشان مامۆستا بە ژنەکەی وت لە ماڵی خوادا لە خوا بترسێت و سەرزەنشتی کرد. هەرچەندە خانمە گەنجەکە ئەوەی خستە ڕوو کە نیازی خراپی نییە و دەیەوێت لە چوارچێوەی فەرمانی خوای پەروەردگاردا مامەڵە

بکات و بێجگە لە خێر بیر لە هیچی دی ناکاتەوە، بەڵام مامۆستا ڕووی پێ نەدا. لە کۆتاییدا خانمەکە بەتووڕەییەوە وتی "کەیفی خۆتە؛ بۆخۆت لەم پەرێشانییەدا بمێنەرەوە!" پاشان چووە دەرەوە.

تاقی ئەو پەنجەرەیەی مامۆستای تێدا دەمایەوە، درێژییەکەی دوو مەتر و پانییەکەشی مەتر و نیوێك دەبوو. سەرجەم کەلوپەلەکانیشی لەوێدا جێکردبووەوە کە بریتیبوون لە دوو بەتانی و دوو قاپ و کەوچکێك و کوپێکی چاخواردنەوە. هەر لە سەرەتاوە بیری لە هەموو شتێك کردبووەوە و دەیویست لە هەموو ئەو هۆکارانە بەدوور بێت کە مرۆڤ بەرەو تەمبەڵی و پاڵ لێدانەوە دەبەن.

بەتانییەکیانی ڕادەخست و ئەوی دیکەشی دەدا بە خۆیدا؛ ڕۆژە سارده بەستەڵەکییەکانی زستان و ئەو شەوانەی کە سەرمای ڕۆژ لە چاویاندا بە هەزار ئاو شۆررابوویەوە، هەر بەم شێوەیە بەسەر دەبرد. لەبەر ئەوەی زۆر کەمخۆر بوو، زۆر کەمیش دەخەوت؛ جاری وا دەبوو چەند ڕۆژێك هیچی نەدەخوارد؛ بەتایبەتیش خۆی لە خواردنی خۆراکی ئاژەڵی دەپاراست.

بەڵێ، لە ئەنجامی ڕێکردن لەسەر ڕاستەهێڵێکی لەمشێوە لە ئیرادە و پاکیزەییەکی هەستیارانە، مامۆستا بە درێژایی ژیانی لاوێتی سەرکەوتووبووە لەوەی ژیانێکی مەردانە و یوسفئاسا بە سەربەرێت.

# من شەیتانم، شەیتان!..

ناوی "عەبدوڵڵا" بوو. بەندەیەك بوو لە بەندەکانی خوا. تەنها بوو. سەرەڕای ئەوەی تەنها دوو مانگ دەبوو لە نیشتیمانەکەی جودابووبووەوە، چەندەی دەکرد نەیدەتوانی بڵێسەی حەسرەت لە ناخیدا خامۆش بکات. ژیان دوور لە زێد بێگومان گەلێ سەخت بوو. هەرچەندە ئەو شوێنەی بۆی چووبوو وڵاتێکی موسڵمان بوو. خەڵك و کلتوری ژیان هاوشێوەی وڵاتی خۆمان بوون، بەڵام دیسان هەر غوربەت و ژینی تاراوگە بوو.

ئیوارەیەکیان لە ماڵەوە دانیشتبوو لە دەرگا درا:

- مامۆستا عەبدوڵڵا! منم، حەمید! ئێمە هاتووین.

دەکرا "حەمید (دراوسێی نهۆمی سەرەوەیان)" نەناسێت؟! یەکسەر چوو دەرگاکە بکاتەوە. دیسان ڕووبەڕووی ئەو ڕوخسارە گەشە بووەوە. کاك "شاهین"ی خاوەنی ماڵە یەك ژوورییەکەشی لەگەڵدا بوو.

فەرمووی لە میوانەکان کرد و خێرا بۆ ئامادەکردنی چا ڕووی کردە چێشتخانەکە. لەپاڵ چاکەدا گفتوگۆکەش دەمبووبوو و، لە بابەتێکەوە بۆ

بابەتێکی تر دەهاتن و دەچوون، نەیانزانی کات چۆن گوزەرا. شاهین بۆ ئێستێك لە کاتژمێرەکەی دەستی ڕوانی و بە شپرزەییەوە وتی:

- کاتی ڕۆیشتنە، درەنگ کەوتووین؛ نەمانهێشت تۆش بخەویت!

حەمیدیش بەم جۆرە هاوبەشیی شاهینی کرد:

- ئای خوایە! کات چەند زوو تێپەڕی! دەی، کاتێکی تر بەردەوام دەبین.

لەو کاتەی هەستابوونە سەر پێ بۆ ماڵئاواییکردن بە زەنگی تەلەفۆنەکە ڕاچڵەکین. عەبدوڵڵا تەلەفۆنەکەی هەڵگرت و وتی "فەرموو!" لەبەرامبەردا دەنگی ئافرەتێك دەبیسترا:

تەلەفۆنەکەی دایە دەست حەمید و وتی:

- بزانە کێیە؟!

چونکە دەیزانی حەمید خەڵکی خۆیان باشتر دەناسێت و دەتوانێت لێیان بگات.

- جەنابتان کێن؛ پەیوەندیتان بە کێوە کردووە؟

- ؟؟؟

- تۆ کێیت؟

- ؟؟؟

- بۆچی تەلەفۆنت کردبوو؟

- ؟؟؟

## چۆن دەکرا مرۆڤ هێندە نزم ببێتەوە؟

ڕوخساری حەمید کە لەگەڵ قسەکردنیدا سوور هەڵدەگەڕا، دڵەڕاوکێی بۆ شاهینیش دروستکردبوو. کەواتە تابلۆیەك لە نارادایە کە مایەی شەرمەزارییە. دیاربوو بەپێی تێپەڕینی کات شتەکە توندتر دەبوو. ئەو حەمیدە خوێن گەرم

و شیرینە بەم بارودۆخە زۆر گۆڕا و بە مەردایەتییەکی عومەر ئاساوە وتی:

- خوشکم، ئەم مرۆڤە پیاوی خوایە و لەو پیاوانە نییە. خێرا تەلەفۆنەکە دابخەرەوە و جارێکی دیکە ئەم پیاوە ناڕەحەت مەکە!

حەمید بە شێوەیەکی توند تەلەفۆنەکەی داخستەوە، بە دەنگی هێواشترەوە ڕووی لە عەبدوڵڵا کرد و وتی:

- گوێی مەدەیە! کەسێکی هەرزە بوو، کە ئەرزشی خۆی نەدەزانی.

شاهینیش بە ئاماژەی سەر پشتگیری لە قسەکانی حەمید کرد.

- کەسی خراپ لەهەموو شوێنێك هەر هەیە...

لە شەرمەزاریدا وەك هەنار سوور هەڵگەڕابوو و ئارەقی شین و مۆری دەردابوو. میوانەکانیشی هەر بەو شەرمەوە بەڕێکرد.

دیسانەوە لەگەڵ تەنهاییەکەیدا دوو بە دوو مانەوە. سەری خستە ناو دەستەکانییەوە و بۆ ماوەیەك لەسەر قەنەفەکە دانیشت. بیری هەر لای تەلەفۆنەکە بوو. چۆن دەکرا مرۆڤ هێندە نزم ببێتەوە! نزمبوونەوە لە لایەك، دەکرا چی بەوە بڵێت کە بەم شەوە ئەو هەموو پێداگرییە دەکات تا کەسانی تر بۆ ئاستی خۆی ڕابکێشێت!

ئەو لاو بوو، ئەو دەمەی تەمەنی دەژیا کە خوێن سەرشێتانە بە دەمارەکانیدا دەهات و دەچوو. لە هەمان کاتدا لە وڵاتێکی بێگانەدا بوو لەوێ کەس نەیدەناسی. دەیزانی جگە لە پەروەردگاری کە پەنای پێ گرتوە هیچ دەسەڵات و هێزێکی دیکەی وەستێنەر شك نابات. خۆی لە بنەڕەتدا بە نیەتی ئەوە هاتبوو ئەو کەسانە بانگ بکاتەوە سەر ڕێی ڕاست کە ڕێیان ونکردبوو.

ژیانیش پڕ بوو لە تەڵە و داو، لەبەر خۆیەوە وتی "ئای چەندە بەربەست

هەیە لەبەردەم کاری چاکەدا!“، لێفەکەی دا بە خۆیدا و لە قووڵایی ناخیەوە وتی ”أعوذ بالله من الشيطان الرجيم“ و ڕاکشا. سبەی ڕۆژێکی پڕ سەرقاڵی چاوەڕوانی بوو!

## دیسان هەمان ئافرەت تەلەفۆنی کردەوە

پاش ئەوەی ڕۆژێکی دیکە گەیشتە کۆتایی و عەبدوڵلاش کە لەگەڵ خۆری بەرەبەیاندا لە ماڵ هاتبوویە دەرەوە و ئێستاش وەك کۆتا کار سەردانی ماڵی خێزانی یەکێك لە قوتابیەکانی کردبوو، هەرچەندە خاوەن ماڵەکەی پێداگریی کرد بۆ ئەوەی ئێوارە میوانی ئەوان بێت، بەڵام ئەو بڕیاریدا بگەڕێتەوە و تەنها ماڵەکەی خۆیی هەڵبژارد کە هاوبەشی هەموو ڕازەکانی بوو.

کاتێك گەیشتە بەر دەرگای ماڵەکەی و دەستی برد بۆ گیرفانی تا کلیلەکانی دەربهێنێت، گوێی لە دەنگێك بوو کە لە ژوورەوە دەهات؛ زەنگی تەلەفۆن لێی دەدا.

بەپەلە دەرگاکەی کردەوە و بەرەو لای تەلەفۆنەکە ڕۆیشت و هەڵیگرت:

- ئەلو
- ؟؟؟
- کێن جەنابتان!
- ؟؟؟

دەنگەکەی دوێنێ بوو. لەدوای ئەو هەموو ئاگادارکردنەوەیە ئەمە چ بوێرییەکە! دیاربوو کە ڕووبەڕووی تاقیکردنەوەیەکی سەخت و دژوار بووەتەوە.

کە زانی بەرامبەرەکەی کەسێکی بەدنیازە، توڕەبوو و بە دەنگی بەرز هاواری کرد بە سەریدا و وتی:

- چ کێشەیەکت لەگەڵ مندا هەیە؟

وەك بڵێیت قسە بۆ دیوار بکات. هەرچی دەکرد و دەیوت و هەر سوکایەتییەکی پێ دەکرد دەنگەکە نەدەگۆڕا، بەڵکو تا دەهات دەنگەکە بێنابڕووانە و فریودەرتر دەهاتە بەر گوێ.

دیسان ئارەقەی شەرم دایگرتبووەوە؛ چونکە هەستی دەکرد پنتی تەلەفۆنەکە دەچووەوە سەر چاڵێکی زۆر قوڵ! زۆر بەخێرایی دەبوو ئەم بەڵایە لە خۆی دوور بخاتەوە. دەکرا یەکسەر دایبخات؛ بەڵام دیاربوو کە دیسان تەلەفۆن دەکاتەوە. باشتر وابوو وانەیەکی باشی پێ بدات و نەهێڵێت جارێکی تر پەیوەندی بکاتەوە. بۆیە سەرەتا پرسی ژمارەکەی لە کوێ دەستکەوتووە؛ ئەویش بە ئەدایەکی بێباکانەوە وتی کە لە فەرمانگەی پۆستەی وەرگرتووە.

دەنگی ڕەقکردەوە و پێی وت کە تەلەفۆنەکە دابخاتەوە و جارێکی دیکە تەلەفۆنی بۆ نەکاتەوە. بەڵام دیاربوو کە لەو زمانە تێناگات، بە دەربڕینی بێنابڕووانە بەردەوامبوو لە ڕیزکردنی داواکارییەکانی و دەیوت کە بەتەنهایە و لەو ئێوارەوەختەدا بانگهێشتی ئەم گەنجەی دەکردە ماڵەکەی کە هیچ نەیدەناسی!

## بڕۆ و لەکۆڵم بەرەوە
## جارێکی تریش تەلەفۆن نەکەیتەوە!

کاتێك بە دەستی ئارەقی ناوچەوانی سڕی، هەستی کرد دەستی دەلەرزێت. درێژەپێدانی ئەم بابەتە هیچ مانایەکی نەبوو؛ لەبەر ئەوە بۆ دواجار هاواری کرد:

- برۆ و لەکۆڵم بەرەوە، جارێکی تریش تەلەفۆن نەکەیتەوە!

کاتێك دەنگی ناو تەلەفۆنەکە هەستی کرد داواکارییەکەی وەرناگیرێت و تەلەفۆنەکەی بەسەردا دادەخرێتەوە، ئەم جارە بەپاڕانەوەوە وتی:

- کەمێك چاوەڕێ بکە، دایمەخەرەوە. ئەگەر تۆ نایەیت، چاوەڕێ بکە من دێم بۆ لات!

وەك چۆن ئاوێکی لەکوڵی بەسەردا بکەن وەهابوو. ماوەیەك بیری لە حاڵی حەزرەتی یوسف کردەوە کە لە ژوورێکدا دەرگایان لەسەر داخست. نا نا! دەبووایە ڕوونتر بێت لەگەڵی. هەستی کرد کات بەفیڕۆدان لەگەڵ ئەم بەڵایەدا بێمانایە. دەیزانی کەمێك دوودڵی و گومان مانای ڕادەستبوونە بە نەفس و شەیتان. بۆیە ئەم جارە توندتر بوو. هاوسەنگیی خۆی تەواو لەدەستدابوو و ددانەکانی جیرکردەوە و هاواری کرد "شەیتان!!!" پاشان تەلەفۆنەکەی داخستەوە.

دواتر لەبەر خۆیەوە وتی:

- ئاوەها دەبێت!

ئەو هاوڕێیەی بە بیردا هات کە ڕووداوێکی هاوشێوەی ئەمەی لێ بەسەرهاتبوو؛ لە درەنگانی شەودا هاتبوونە بەر دەرگاکەی و ئەویش بە وێنەی حەزرەتی یوسف زانیبووی چۆن دەرگاکەیان بەسەردا دابخاتەوە. بەس خوا دەزانێت لەچەند کۆڕ و گفتوگۆدا باسی ئەو قارەمانێتی و نازایەتییەی ئەوی کردبوو! دیارە کاتێك مرۆڤ لە ڕاستەهێڵی مرۆڤایەتی دوور دەکەوێتەوە، بەم ئەندازەیە نزم دەبێتەوە!

دەیزانی کە پاڵەوانی ڕاستەقینە لەم دۆخانەدا دەردەکەوێت. هەنگاونان

بەرەو پاش لە کاتی خۆیدا و هەڵبژاردنی زیندان لەپاڵ دووچاربوون بە زینادا مەردایەتیی ڕاستەقینەیە.

## ناتوانم بەتەنها بەرگەی ئەم بەڵایە بگرم!

قورئانی پیرۆزی گرتە دەست و دەستی کرد بە خوێندنەوەی ئەو سورەتەی بە ناوی حەزرەتی یوسفی پیری ئەو مەردانەوە دابەزیبوو کە گۆشەی زیندانیان کردبووە قوتابخانە. هەر وێستگەیەکی سورەتەکە، تێپەڕاندنی هەر بەڵایەك لەو بەڵایانە لە لایەن حەزرەتی یوسفەوە ئارامگری بەم دەبەخشی. بەڵا و چەرمەسەرییەکانی نێو ژیانی حەزرەتی یوسف (عَلَيْهِ السَّلَامُ) ئەویشی بەرەو جوانی دەبرد، لە لایەکەوە لەنێو ئەو کەشەدا دەژیا کە ناخی گەرم دەکردەوە و، لەلایەکی دیکەوە بەکوڵ ئەسرینی دەڕشت. دەیوت "ناتوانم بەتەنها بەرگەی ئەم هەموو بەڵایە بگرم" و ڕووی لە خوای پەروەردگار دەکرد. بەپێوە مانەوە لەم زەمینە خلیسکەدا تەنها بەوە دەبوو پەنا بە هێزی ئەو بگرێت. لەبەر ئەوە کاتژمێرەکەی خستە سەر زەنگ و ڕاکشا؛ تا لەو کاتە پیرۆزەی شەودا کە دەمی ژوانی ئەویندارانە لەگەڵ یاری ڕاستەقینەیاندا هەستێت و لەدەرگای میهری یار بدات و ڕۆحی ڕووناك بکاتەوە.

پاش هەستان و ڕاز و نیاز و پاشان ئەنجامدانی نوێژی بەیانی، سەرقاڵی تەسبیحاتەکەی بوو. لەو کاتەدا کە دەیوت "اللهم أجرنا من شر النساء"، "من بلاء النساء" و "من فتنة النساء"، ڕاچڵەکی.

هەستیدەکرد کە پەنای بە خوای پەروەردگار گرتووە لەو مرۆڤانەی کە بەرگی شەیتانیان پۆشیوە! ئەم دەربڕینانە چەندە لە شوێنی خۆیدا بوو بۆ

ئەوانەی کە تا ئەندازەی دڕاندنی پەردەی شەرم و شکۆ بووبوونە دڕندە! ڕەنگە سالآنێك بێت ئەم نزایە هۆکاربووبێت بۆ ئەوەی بەدەم بانگهێشتە یەك لە دوای یەکەکانەوە نەچێت. هەستی کرد بەم دەربڕینە گونجاوانە لە دەرگای دروستی داوە. هەر بۆیە نەدەبوو لەو دەرگایە دوور بکەوێتەوە.

لە قووڵایی ناخییەوە هەستی بە ئاسوودەییەکی شیرین دەکرد. ڕەنگبوو تا ئەو ڕۆژە هەزاران جار بەدەم ئەو نزایانەوە لە پەروەردگار پاڕابێتەوە بەڵام هیچ کاتێك چێژێکی هێندەی ئەو بەیانییەی هەست پێ نەکردبوو. نەیدەویست نەغمەی ئەم هەستە لەدەست بدات، چاوەکانی داخست و ویستی دووبارە بە هەمان ئەو نزایانە لە دەرگانەی پەروەردگاردا پڕ بە دڵ بپاڕێتەوە "اللهم أجرنا من شر النساء! اللهم أجرنا من بلاء النساء! اللهم أجرنا من فتنة النساء!" "ئیلاهی! بمانپارێزە لەشەڕی ئافرەتان! ئیلاهی بمانپارێزە لە بەڵای ئافرەتان! ئیلاهی بمانپارێزە لە تاقیکردنەوە بە ئافرەتان!"

## لە لایەکەوە دەگریا، لە لایەکەوە نزای دەکرد

سێیەم ئێوارەی بۆ یەکێك لەو کتێبانە تەرخانکرد کە کاتی تەنیایی لەگەڵدا بەش دەکردن. لەگەڵ ئەو کتێبەدا دەردەدڵی دەکرد. خوێندیەوە... خوێندیەوە. کە گوێی لە ناڵەی بەدمەستانی سەر شەقامەکە بوو، سەیری کاتژمێرەکەی دەستی کرد؛ نیوەی شەو بوو. ویستی بۆ دەستنوێژشوشتن بۆلای دەستشۆرەکە بڕوات و دیسان زەنگی تەلەفۆن دەستی کرد بە لێدان. سەرەتا شڵەژا. لەم کاتەدا.. نا، مەحاڵ بوو ئەو بێت. بەتایبەت پاش ئەو تووڕەبوونەی کۆتا جار هەرگیز نەیدەوێرا دیسان پەیوەندی بکاتەوە. لەبەر ئەوە دەبوو کەسێکی تر

بێت. ئەگەرێکی زۆر بوو یەکێك لەو هاوڕێیانە بێت کە چووبوون بۆ وڵاتانی دی. بە ئومێدی گوێبیستبوونی دەنگێکی ئاشنا تەلەفۆنەکەی هەڵگرت:

- بەڵێ

- ؟؟؟

- ئەلو

- ؟؟؟

دەنگ نەدەهات. لەو ڕۆژانەدا تەلەفۆن بۆهاتن لەلایەن دۆستانەوە؛ دژوار بوو، هەر بۆیە نەتدەتوانی سووك و ئاسان دایخەیتەوە. لەبەر ئەوە دەنگی بەرزکردەوە و جارێکی تر وتی:

- کێن جەنابتان؟

گوێی لە دەنگێك بوو کە نیشانیدا کەسێك لەسەر هێڵەکەیە. بەڵام لەبەر ئەوەی کەسەکە قسەی نەدەکرد تێنەدەگەیشت کە کێیە. ئەم جارەیان دەنگی بڵندتر کردەوە و وتی:

- ئەلو، کێتان دەویست؟ جەنابتان کێن؟

سەرەتا قاقایەکی دووروودرێژی لێ بەرزبووەوە. دواتریش بە ئەدایەکی بێشەرمانەوە وتی:

- منم، "من شەیتانم، شەیتان!"

ڕاچڵەکی. سەرەڕای ئەو هەموو تووڕەبوون و سووکایەتیپێکردنەی جاری پێشوو، دیسان هەر ئەو بوو. لە کاتێکدا ئەو وای هەست دەکرد لەپاش هەڵوێستەکەی دوێنێ ئیدی ئەو دەفتەرە داخراوە. کەچی ئێستا ڕووبەڕووی بێنابڕوویەکی چاوەڕواننەکراو بووەتەوە. دیاربوو کە ئەم دوێنێ

وەك سووکایەتییەك بە شەیتان ناوزەندی کردبوو، ئەویش ئەمڕۆ بەو ناوەوە خۆی پێ دەناساندەوە، بە خەیاڵی خۆی خۆیی خۆشەویست دەکرد، سەرەڕای ئەو هەموو سووکایەتییە کە ئەم وەك ستایش وەریگرتبوون، دەیویست بەم درەنگانەی شەو بێت بۆ لای عەبدوڵڵا!

سەرەتا دەسکی تەلەفۆنەکەی لە گوێچکەی دوورخستەوە کە دەنگی نەشیاوی لێ دەهات. لە لایەکیشەوە بە لاچاو بۆ دەسکی تەلەفۆنەکەی دەڕوانی. بێزی دەهاتەوە. چونکە هەستی دەکرد پارچەیەك پیسی لە مشتیدایە، خێرا دایخستەوە. شەیتان دەنگی نەما.

لەسەر زەوییەکە دانیشت و پشتی دا بە دیوارەکەوە. بێزاربوو. بۆ ئەوەی توڕەییەکەی بخواتەوە لێوەکانی خۆیی دەگەست. سەیری دەوروبەری خۆی کرد. ئێستا چەندە ئاتاجی سیمایەکی ئاشنابوو تا ببێتە پاڵپشتی!

ناخی پڕبووبوو. لەپاڵ سینەی پڕ خەمیدا هەستەکانیشی گەیشتبوونە گەورەیی تۆفانەکان. تۆفانی نێو دونیای ڕۆحی لە شێوەی ئەسریندا بە چاوانیدا هاتنە خوارەوە. گریا، گریا. لە لایەك دەگریا، لە لایەکیش بیری لەوە دەکردەوە کە چ کۆششێکی زۆر پێویستە بۆ پێگەیاندنی نەوەیەکی چاك و خاوەن ڕەوشت و بەها.

# بەم بارودۆخەمەوە چۆن بچمە ناو خەڵکی؟

کاك "شاکیر نۆز" دەگێڕێتەوە:

بومەلەرزەکەی ١٧ی ئابی ساڵی ١٩٩٩ وەك ناوچەکانی ئەداپازاری و ئیزمیت و گۆلجوك ناوچەی یالۆڤاشی گرتەوە. سەدان باڵەخانە تەختی زەوی بوون.

ماڵی ئێمە و دەوروبەری ماڵمان هیچ زیانێکی لێ نەکەوتبوو. بەو شەوەش هیچ شتێك نەدەبینرا. پاش ٥ بۆ ١٠ خولەك دەنگی ئۆتۆمبێلی فریاکەوتن و ئاگرکوژێنەوە ئەو ناوەی تەنی، ئێمەش پەشۆکابووین و دەمانوت "بڵێی خانوو ڕووخابێت و خەڵکی زیانیان لێکەوتبێت؟!" چونکە لە "یالۆڤادا" خزم و دۆست و قوتابی و قوتابخانەمان هەبوو. وتم "با بە ئۆتۆمبێلەکە بڕۆین بارودۆخی خزم و دۆست و چواردەور بزانین." تەماشام کرد باڵەخانەیەکی زۆر ڕووخاوە؛ سووڕانەوەی خەڵکانێك بە جلی خەوەوە لەسەر شەقامەکان، نرکە و ناڵەی بەسۆی ژێر شوێنە ڕووخاوەکان کەشێکی هاوشێوەی مەحشەریان دەهێنایە پێش چاو.

ئەو بینایەی کە ماڵی "دکتۆر ساڵح ئۆزاڵپی" خوشکەزامی لێبوو بەتەواوی ڕووخابوو. تۆ بڵێیت ساڵح و خێزانی و سێ منداڵەکەیان لەنێو ئەم ڕووخانەدا بەسەلامەتی دەرچووبن؟ هەیهات!

"موژدات"ی برازام و هاوسەرەکەی لە هیچ شوێنێکەوە دیار نەبوون. تۆ بڵێیت شتێکیان بەسەر نەهاتبێت؟ "ڕێزوان"ی برازای خێزانمان لەگەڵ خێزانەکەیدا دۆزییەوە. ئەوان سەلامەت بوون. خزم و دۆستەکانی تریشمان دۆزیبووەوە، بەڵام موژدات دیار نەبوو. نزام بۆ دەکرد و دەموت "ئینشائەڵڵا هیچی بەسەر نەهاتووە." تەڵام تادەهات لەبارەی دکتۆر ساڵحەوە نومێدبڕاو دەبووم.

## لە ژێر وێرانەکەوە بە بریینداری دەریانهێنان

دواجار زانیمان کە ماڵەکەی موژدات ڕووخاوە، بەڵام لەژێر دار و پەردووی ماڵە ڕوخاوەکەیاندا دەنگی موژدات و خانمەکەی بیستراون. ناوێك بە دڵ و دەروونماندا کرا. زۆر گەنج بوون. پێش هەشت مانگ هاوسەرگیرییان کردبوو. نزیکەی نۆ کاژێر پاش بومەلەرزەکە بەبرینداری لەژێر ئەو وێرانەیەدا دەرهێنران. دەستبەجێ ناردیانن بۆ شاری بورسا.

سوپاس بۆ خوا ئەوان ڕزگاریان بوو. ئیدی شەو و ڕۆژ لەبەردەم بینا ڕووخاوەکەی ماڵی دکتۆر ساڵحدا چاوەڕوان بووین تا بەزیندوویی بێت یاخود بەمردوویی جەستەیان دەربهێنین و ڕێکاری پێویستیان بۆ ئەنجام بدەین. پاش چوار پێنج ڕۆژ لە هەوڵ و گەڕان، جەستەی ئەوانیشمان بەبێگیانی دۆزییەوە و بردمانن بۆ مەنزڵگا نوێیەکەیان. پاش ئەوەی کار و بارەکانی بەخاکسپاردنی

دکتۆر ساڵح و خێزانەکەیمان بەڕێکرد چووین بۆ نەخۆشخانە بۆ لای موژدات و شەیمای هاوسەری کە لە دوو نەخۆشخانەی جیاواز چارەسەریان بۆ دەکرا. لەو سەردانەماندا موژدات بەسەرهاتی ئەو ۹ کاژێرەی بۆ گێڕاینەوە کە لەژێر دار و پەردووی باڵەخانە ڕووخاوەکەدا بەسەریان بردبوو. لە کاتی گێڕانەوەکەدا جار جار بۆ ئیستێك دەوەستا، تفێکی قووت دەدا و دواتر کە دەهاتەوە هۆش خۆی دیسان بەردەوام دەبوو.

## لێرە پێکەوەبووین، با لەوێش پێکەوەبین

کاتێك بومەلەرزەکە دەستی پێ کردبوو هەستابوون تا گیانی خۆیان ڕزگار بکەن؛ لەو کاتەدا کە ئەوان گەیشتوونەتە ڕاڕەوی ناوەند کار لە کار ترازاوە و باڵەخانەکە ڕووخاوە، ئەوانیش کەوتوونەتە سەر زەوی و توانای جوڵەشیان نەبووە.

ئەو ئۆکسجینەی کە لە کونێکی بچووکەوە پێیان گەیشتووە وای کردووە بەئاسایی هەناسە هەڵمژن، بەڵام کاتێك باڵەخانەکە هەرەسی زیاتری هێناوە، ئەو کونەهەوایەش داخراوە؛ بەو هۆیەوە لەو ژێرەوە بێ هەوا ماونەتەوە. موژدات کە ئیدی ئومێدی لە ژیان بڕاوە، بە خانمەکەی وتووە:

- بڕوانە شەیما ئیدی ئێمە دەمرین. لە گۆڕدا دەماننێژن. لەوێ فریشتەکانی مونکەر و نەکیر دێن و دەپرسن "پەروەردگارت کێیە؟ ئایینەکەت چییە؟ پێغەمبەرەکەت کێیە؟ کتێبەکەت چییە؟" بیرت نەچێت لە وەڵامدا بڵێیت "پەروەردگارم الله یە و، ئیسلام ئایینمە و، پێغەمبەرەکەم حەزرەتی موحەممەدە (صَلَّىٰ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و کتێبەکەشم قورئـانی پیرۆزە" بـــاشـــە؟ لێرە پێکەوە بووین

با لەوێش پێکەوە بین، نەکەیت هەڵە بکەیت و وەڵامی دیکە بدەیتەوە.

پاش ئەم قسانەی من شەیما وتی:

- زوبەیر تۆش لەیادی نەکەیت. بڵێ "پەروەردگارم الله یە، ئایینم ئیسلامە، پێغەمبەرەکەم موحەممەدە (صَلَّیٰ اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمَ)، کتێبەکەم قورئانی پیرۆزە" باشە؟

لەو کاتەدا کە زانرا ئەمان زیندوون و ئومێدی ڕزگاربوونیان بۆ گەڕایەوە، شەیما بەگریانەوە وتی:

- مژدات، ئینشائەڵڵا دایکم تەنورە و لەچکەکەمی لەیاد ناچێت؛ ئەگینا من چۆن بەم حاڵەمەوە بچمە نێو خەڵکی.

## شەیما دەگات بە ڕەحمەتی جەنابی حەق

سەرەڕای ئەوەی سەدان پارچە شووشە بە جەستەیدا چەقیبوو و، دەیان قورسایی بەسەردا کەوتبوون، ئەم خانمە کە تابلۆیەکبوو لە پاکیزەیی بەو هێزەوە کە ئیمان پێی بەخشیبوو حسابی ناو گۆڕی دەکرد و کاتێکیش ئومێدی ڕزگاربوون بەدەرکەوت حسابی بەرگ و داپۆشراویی دەکرد. لە کاتێکدا کە هەمووان نرکەی هاواری فریاگوزارییان دێت، ئەوان بەتەوەککولەوە حسابی ئەولایان دەکەن.

شەیما لە ئەنجامی ئەو زەبرە کوشندەیەی بەری کەوتبوو پاش ١٥ ڕۆژ لە ڕووداوەکە کۆچی دوایی کرد. نزامان ئەوەیە بەویستی خوا شەربەتی شەهادەتی نۆشکردبێت. ساکینەکانی مەلەئی ئەعلا بە خۆشنوودییەوە پێشوازییان لێکردبێت.

# دەرگایەک هەیە لە توانای مندا نییە دایبخەم

پیاوێکی تا بڵێی دەوڵەمەند بوو. هەمووان خۆزگەیان پێ دەخواست. کارگە و شوێنکاری هەبوو و ژمارەیەکی زۆری کرێکار کاریان بۆ دەکرد. خاوەنی خۆشترین ڤێللای شارەکەش بوو.

ڤێللاکەی باخێکی زۆر خۆش و مەلەوانگەیەکی تێدابوو. پڕبوو لە گوڵی ڕەنگاوڕەنگ، جێگایەك بوو هەرکەس چاوی پێی بکەوتایە دووبارە تەماشای دەکردەوە. ژن و مێردێکی گەنج کە تازە هاوسەرگیریان کردبوو لای ئەم پیاوە دەست بەکار بوون بۆ ئەوەی کار و باری باخی ڤێللاکە جێبەجێ بکەن. پیاوە گەنجەکە باخەوان بوو. لەگەڵ خانمەکەیدا هەموو کاروبارێکی باخەکەیان لە ئەستۆ گرتبوو.

خێزانی باخەوانەکە ئافرەتێکی گەنج و جوان بوو. ئەم جوانییەی لە سەرنجی خاوەن ماڵە دەوڵەمەندەکە لا نەدەچوو. لەبەر خۆیەوە دەیوت ”هەرچییەکم کردووە دەبێت ببمە خاوەنی ئەم ئافرەتە.“

دواجار بیرۆکەیەکی لەم جۆرەی بە مێشکدا هات: باخەوانە گەنجەکەی

بۆ کارێك دەنارده دەرەوه و، بەم شێوازه لەگەڵ ئافرەتەکەدا بە تەنها دەمانەوه. بەڵێ، هەر بەو شێوەیەی کرد. دواتر هاتە باخچەکەوه. ئافرەتەکە لە باخەکەدا ئاوی گوڵەکانی دەدا. بەهێمنی لێی نزیکبووەوه و پێی وت:

- دەرگاکانی باخەکە دابخە. با هیچ دەرگایەکی بە کراوەیی نەمێنێتەوه!

ئافرەتەکە خانمێکی عاقڵ و بەڕەوشت بوو. تێگەیشت کە کابرا نیەتێکی خراپی لەبەرامبەریدا هەیە. زۆر ترسا. ئاخر پاکیزەییەکەی هەموو شتێکی بوو. خێرا لەوێ ڕایکرد و لەپشت دارێکەوه خۆی حەشاردا. پاش ماوەیەك هاتەوه و وتی:

- دەرگاکانم داخست. جگە لە دانەیەکیان، لە توانامدا نییە ئەوەیان دابخەم.

چەندێك هەوڵیش بدەم ناتوانم.

- کام دەرگایە دەڵێیت؟

- ئەو دەرگایەیە کە پەروەردگارمان لێوەی بە ناو و سیفەتی پیرۆزی "البصیر"ەوه بۆ ئێمە دەڕوانێت.

بابای دەوڵەمەند چاوەڕێی وەڵامێکی وەها ژیرانە و پڕ و حیکمەتی لەو ژنە نەدەکرد. سەرسام بوو. یەکسەر هاتەوه هۆش خۆی و، بەخێرایی لەوێ دوورکەوتەوه و چووه ناو ماڵەکەی. پەشیمانبووەوه و تەوبەی کرد. بۆ کەفارەتی گوناهەکانیشی سەدەقە و خێرێکی زۆری بەسەر خەڵکیدا دابەشکرد.

# دایە گەورە، نەمانتوانی "هەدیە"کەت بپارێزین، گەردنمان ئازادبکە!

"هەدیە" کچێکی جوانکیلە بوو، تازە قۆناغی ناوەندیی تەواوکردبوو. من لەو خوێندنگەیەدا کە بەڕێوەبەرێتیم تێدا دەکرد، پێش خۆی دایە گەورەیم ناسیبوو. چونکە ئەو هەدیەی لە خوێندنگاکەمان تۆمارکردبوو و، کتێب و پێداویستییەکانی خوێندنگەی بۆ دابینکرد. ئەم خانمە چوستە کە تەمەنەکەیی پێوە دیار نەبوو، بووبووە دایك و باوکی ماڵەکەیان. ئەگەرچی بڕوانامەیەکی وەهاشی نەبوو بەڵام ژنێکی ڕۆشنبیر بوو. بەڵام تا بڵێی ڕێکوپێك و سەلار بوو. لەنێو مانتۆکەیدا کە بەژنە بەرزکەی داپۆشیبوو، کەسێکی تا بڵێی بەویقار دەردەکەوت. ئەوەی جێگای سەرنج بوو لەچکەکەی لە هەموو وەرزێکدا سپی بوو. کوڕەزاکەشی کچێکی جوانی وەك ئەو باڵابەرز بوو. بەڵام جیاواز لە ویقارەکەی داپیرەی کەسێکی سەرەڕۆ بوو، بەردەوام پێدەکەنی و لە وانەکانیشیدا بێناگا بوو.

دیاربوو بە تێپەڕینی کات ئەم بارودۆخی زوو هەڵچوون و گەورەبوونەی

هەدیە سەرنجی داپیرەی ڕاکێشابوو؛ ئیدی هەدیە بەردەوام لەگەڵ داپیرەیدا دەهات بۆ قوتابخانە. زۆر جار داپیرە تا قوتابییەکان دەچوونە وانەی یەکەمیشەوە چاودێریی هەدیەی دەکرد. بە ڕواڵەت گفتوگۆی لەگەڵ خاتوو عائیشەی کارگوزارماندا دەکرد، بەڵام بەردەوام چاوی لەسەر کوڕەزاکەی بوو.

زۆرجاریش کوڕەزاکەی بە خاتوو عائیشە دەسپارد و هەستم دەکرد ئەویش دوور بە دوور چاودێری کچەکە دەکات.

ڕۆژێکیان زۆر بەزەییم بەم ژنە بەتەمەنە دونیادیدەیەدا هاتەوە کە هەموو بەیانییەك بێ گوێدانە بەفر و باران و قوڕ و چڵپاو بە وێنەی منداڵێکی سەرەتایی کوڕەزاکەی دەهێنا بۆ قوتابخانە. بانگم کرد بۆ ژوورەکەم و چایەکم بۆ هێنا. پرسیم:

- پوورێ گیان، دەبینم هەموو بەیانییەك لەگەڵ ئێمەدا بێگوێدانە بەفر و باران دەوام دەکەیت. بێجگە لە ئێوە هیچ بەخێوکەرێکی تر نابینم هەموو ڕۆژێك بێت بۆ ئێرە.

- سەرەتا کەمێك بەشەرمەوە مامەڵەی کرد، نەیویست قسە بکات. بەڵام کاتێك بینی من سوورم لەسەر ئەوەی هۆکارەکەی بزانم، وتی:

- ڕۆڵــە گیان، تاوەکو دەمرم هەموو بەیانییەك کوڕەزاکەم دەهێنم و هەموو ئێوارەیەکیش دەیبەمەوە. چونکە ئەو تاقە یادگاریی دایك و باوکییەتی بۆ من. ناوی خۆی بە خۆیەوەیەتی تاقە هەدیەی تاقە کوڕەکەمە. زۆر خەمی داهاتووی دەخۆم. تەنانەت لەبەر ئەو هەموو ماڵ و سامان و خزمێکی خۆمم لە بولگاریا بەجێهێشت و گەڕامەوە بۆ تورکیا...

هەموو شتێکم لەپێناو ئەم منداڵەدا ئەنجامدا. چونکە ئەو مەملەکەتەی

کە کوڕ و بووکە داماوەکەمی بەهەدەردا هەمان چارەنووسی بۆ کوڕەزاکەشم ئامادەکردبوو. ویستم هیچ نەبێت کوڕەزاکەم لە نیشتیمانەکەمدا وەك موسڵمانێك پەروەردە ببێت. بیر و باوەڕ و ڕەوشت و ئەسڵ و بنەچەی خۆی لەبیر نەکات. دەمەوێت ئەو گرنگی و بایەخەی کە نەمتوانی بە منداڵە داماوەکەمی بدەم، بیدەمە ئەم کوڕەزایەم.

من لەپێناو ئەم منداڵە و ئایین و ناموسمدا گەڕاومەتەوە بۆ ئێرە. ئەگەر لەوێ بمامایەتەوە نەمدەتوانی بەم شێوەیە لەگەڵیدا بم و چاوم لێی بێت. لێرە هیچ نەبێت تا بۆم بکرێت بەتەنها جێی ناهێڵم. سەرەڕای تەمەنەکەشم هەوڵ دەدەم هاوڕێیەتیی بکەم. ئەوەی داوای دەکات بەپێی توانام بۆی دابین دەکەم. بەس خۆزگە کەمێك ئازاری جێهێشتنی گۆڕی دایك و باوکی کە لە بولگاریا جێم هێشتوون لەسەر کەم ببێتەوە.

لێرەدا پیرەژنەکە ڕووی سەرە بەرز و بەویقارەکەی کردە لایەکی دیکە و ویستی چاوە تەڕەکانی لە من بشارێتەوە، منیش وتم:

- تۆ هەموو ڕۆژێك خۆت ماندوو مەکە، من خۆم ئاگام لە کوڕەزاکەت دەبێت. هیچ نەبێت ئەم هەموو کاتە چاوەڕێ مەبە.

- سوپاست دەکەم ڕۆڵەکەم. خۆ من کار و پیشەیەکی دیکەم نییە. ئەم منداڵە هەموو دونیای منی پڕکردووە، بەم جۆرە دڵم ئۆقرە دەگرێت. بێکەسە، نەفامە، دڵسافە، هەوا و ئارەزووی هەیە. ئێوەش ئاگاتان لێی بێت، بەس من هەتا تەمەنم مابێت لێی غافڵ نابم. چونکە هەر بەگەنجی کوڕەکەمم لەدەستدا بە هۆی ئەوەوە کە گرنگیی پێویستم پێ نەدا. ئازاری ئەو زیاترە. قەینا با ماندوو ببم بەس نێوچاوانم سپی و دڵم ئاسوودە بێت.

## ئێستا چی بە دایەگەورەت بڵێین؟

بە درێژایی ئەو سێ ساڵە ئەم داپیرەیە هاتوچۆی لەگەڵ کوڕەزاکەی کرد. وەك نەوەکەی دەوامی خوێندنگەی کرد. بەڵام بەداخەوە لە کۆتاییدا ئەو شتەی داپیرەی هەدیە لێی دەترسا ڕوویدا. هەدیە لەبەر ئەوەی زۆر حەزی دەکرد ببێت بە هونەرمەند سەرەڕای هەموو ئەو چاودێرییانەی داپیرەی، بەنهێنی و لەڕێگەی ئاڵوگۆڕی نامەوە چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئۆفیسی کەناڵێکدا کرد و بە مەبەستی پەرەپێدانی بردیان. بەڵام پاش پازدە ڕۆژ لەگەڵ کۆمەڵێك کچی دیکەی قوربانی دەستی هەمان ئارەزوودا دۆزرانەوە و پەیوەندی بە خێزانەکانیانەوە کرا.

دەبوو من ئەم ئەرکە زۆر قورسە لە ئەستۆ بگرم. هەدیە ناونیشانی منی دابوو بە پۆلیس. دەبوو من بیبەمەوە بۆ لای داپیرەی. لەبەر ئەوەی داپیرەی منی خۆشدەویست ڕەنگبوو لە هەدیە خۆش ببوایە. منیش دەبوو لەگەڵ هەدیەدا لەو بپاڕێمەوە. ئەمە تکای هەدیە بوو لە من.

منیش وتم:

- باشە دەبێت سەرەتا من بتبورم. ئایا من لێت خۆش بووم تاوەکو ببمە هۆکار بۆ ئەوەی داپیرەت لێت خۆش ببێت؟

هەدیەی داماو بە هۆی ئەو هیوا بڕاوییەی تووشی هاتبوو هەموو دونیای لێ تاریك بووبوو، دوای ئەم قسانەم بێدەنگبوو. ئیدی تەنها بەبێدەنگی فرمێسکی دەڕشت.

لە ڕێگادا بەردەوام بیرم دەکردەوە، دەبێت چی بڵێم بەو ژنە بەڕێزە، ئەو ژنە نموونەییەی لەپێناو ئایین و ژیانێکی شەرەفمەندانەدا کۆچی هەڵبژارد؟

بە چ بیانوویەکەوە داوا بکەم کوڕەزاکەی قەبووڵ بکاتەوە؟ ئەمە کارێکی هێندە دژوار بوو... بەردەوام بیرم لێ دەکردەوە... ڕستەیەکی بەرگریکردن و دڵنەوایی وەهام بە خەیاڵدا نەدەهات کە خۆشم نەکاتە هاوبەشی تاوانەکە. لە ڕێگا لە هەدیەم پرسی:

- ئێستا چی بە دایە گەورەت بڵێین؟

- نازانم، گەر شتێکم بۆ وتن هەبووایە پێداگریم لەسەر هاتنی ئێوە نەدەکرد. بەڵام بە ڕوخساری هەدیەدا دیاربوو کەمێك پشتی بە فرمێسکەکانی ئەستوورە. وەك چۆن لە دژوارترین کاتەکاندا لە هەمبەر دایە گەورەیدا بەکاری دەهێنا.

## چی بوون ئەو فرمێسکانەی منیان جێ نەدەهێشت؟

کە هاتینەوە بۆماڵەوە، بینیمان ئەو ژنە چوست و چالاکەی جاران دە ساڵ لە تەمەنی خۆی پیرتر بووە و لە جێدا کەوتووە. چاوی بڕیبووە سەقفەکە و جوڵەی نەدەکرد. نە دەگریا، نە قسەی دەکرد...

پاش کەمێك گومان و دوودڵی، هەدیە خۆی خست بەسەر دەست و پێیدا و دەستی کرد بە هاوار و گریانێکی بەکوڵ. بەڵام لە وەڵامی ئەمەدا هەست بە بچووکترین جوڵەش نەدەکرا. داپیرە وەك ئەوەی جەستەیەکی بێڕۆح بێت چاوەکانی بۆ خاڵێکی نادیار دەیانڕوانی.

لەبەرامبەر ئەم هاوار و فەریادە دڵهەژێنەی نەوەکەیدا، تاکە کاردانەوەی داپیرە لێکنانی چاوەکانی بوو. بۆ ئەوەی ئەم ئافرەتە بەڕێزە لەوە زیاتر بێزار نەبێت، کە دیاربوو نەیدەویست تەنانەت قسەش بکات، دەمویست چ زووتر نەوێ جێبهێڵم. ئایا لە منیش تووڕەبوو، یان نەیدەتوانی قسە بکات؟

ڕەنگە هۆکاری ئەو شێوازی مامەڵەیەی خۆپاراستنی بووبێت لە قسە و قسەڵۆکی ئەو ژنانەی کە چاوەڕێی بابەتێکیان دەکرد تا بیکەنە بنێشتەخۆشەی دەمیان. لە ڕاستیدا من لەو بارودۆخە ڕازیبووم. چونکە نە دەمتوانی وەڵامی بدەمەوە، نە دەمتوانی لەبەرامبەر سەرزەنشتەکانیدا بەرگری بکەم، نە دەشمتوانی بەرگەی فرمێسکەکانی بگرم. هەربۆیە لەوێدا بەو شێوازە بەجێم هێشتن. بەڵام ئەسرینەکان چاومیان جێ نەدەهێشت، پاڵەپەستۆیەکی بەسۆ دڵمی توند دەگوشی.

پاش هەفتەیەك لە مەڕاسیمی بەخاکسپاردنی دایەگەورەدا هێشتا پڕ بووم لەم هەستانە و لەبەر خۆمەوە دەمناڵاند:

"وەك پارچەیەك لەو کۆمەڵگایەی کە نەیتوانی هەدیەکەی تۆ بپارێزێت، منیش تاوانبارم دایە گەورە! گەردنم ئازاد بکە!"

# چۆن خۆمان لە تەماشاکردن دیمەنە نەشیاوەکان بپارێزین؟

ئەو ڕۆژە مامۆستا عوسمان لە هەموو ڕۆژەکانی دیکە خەمگینتر بوو. لە ڕوخساریدا هەستت بە ئازاری دەروونی دەکرد. دەنگی هێندە کاریگەر بوو، وتە شیرینەکانی لەگوێچکەی ئەو گەنجانەوە دەچووە ژوورەوە و لە دڵیاندا جێگیر دەبوو. ئەوان هاتبوون تا گوێبیستی وتەکانی بن.

گەنجێك لەسەر کورسییەکەی بەرامبەر مامۆستا عوسمان دانیشتبوو. پرسیارێکی کرد کە دەرد و کێشەی هەموو گەنجانی سەردەمەکەمانە، وتی:

- مامۆستا! لە ڕۆژگاری ئەمڕۆی ئێمەدا بازاڕ و شوێنی کڕین و فرۆشتنەکان، تەلەفیزیۆنەکان، ڕۆژنامەکان، گۆڤارەکان، پێگەکانی ئینتەرنێت هەموویان پڕن لەو دیمەنانەی کە بەرەو گوناهمان دەبەن. چی بکەین بۆ ئەوەی نەکەوینە ژێر کاریگەریی ئەم جۆرە دیمەنانەوە؟

مامۆستا عوسمانیش گەنجێکی سیساڵان بوو. لەبەر ئەوە زۆر بەباشی لەو گەنجە تێ دەگەشت کە پرسیارەکەی کردبوو. بەم جۆرە دەستی بە قسەکانی کرد:

"هاورێ بەڕێزەکانم. مرۆڤ لە نیگایەکدا، لە گوێگرتنێکدا دەکەوێتە خەیاڵگەلێکی وەهاوەکە ئەو یەکەم هەنگاوە زەمینە بۆ کارە نەسڵەکە خۆش دەکات. هەر دیمەنێك کە شەیتان دەیهاوێتە خەیاڵی مرۆڤەوە، هەر پارچەیەك، لە کامێرای خەیاڵدا شێوەی فیلمێك وەردەگرێت؛ دەبێتە هۆکار بۆ بەرجەستەبوونی گوناهـ. جا گەر مرۆڤ بووە کۆیلەی نەفسیشی، ئیدی زۆر بەئاسایی دیمەنەکانی نێو زیهنی دەبن بە کردار.

هەموو گوناهەکان سەرەتا لە خەیاڵدا سەرهەڵدەدەن، دواتر دەگوازرێنەوە بۆ نیەت و، بڕیاردان و، کردار. بۆیە دەبێت بەندەیەکی دڵسۆزی خوا هەموو ئەو بیرکردنەوانەی خەیاڵ دەشێوێنن بە مارێك و، هەموو ئەو تابلۆ و بیرۆکانەی هۆکارن بۆ ئەنجامدانی گوناهـ بە دووپشکێك بزانێت و هەوڵ بدات نەکەوێتە ناو داو و تەڵەی ئەم دوژمنە فێلبازانەوە و، گەر کەوتیشە ناویان هەوڵی ڕزگاربوون بدات.

مرۆڤ لەنێو چ کەشێکدا بێت، لەژێر کاریگەریی چیدا بێت و، لەنێو گۆڕەپانی موگناتیسی کێشکردنی چیدا بێت؛ ئەو وێنە و دیمەنانەش کە لە خەیاڵیدا سەرهەڵدەدەن زیاتر هەر لەو جۆرە دەبن.

ئەو کەسەی لە سینەما یان تەلەفیزیۆندا تەماشای ئەو دیمەنە نەشیاوانە دەکات کە نەفسی حەزی لێیانە و بەرەو شەهوەت بانگی دەکەن، مەحاڵە لەو ساتەدا و بەو حاڵەتە ڕۆحییەوە بیر لە ئیمانی مرۆڤەکان بکاتەوە و بکەوێتە دوای گەیاندنی پەیامە مەزنەکەی پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە دڵە تینووەکان.

## دڵەکانتان بە دیمەنە نەشیاوەکان بریندار مەکەن!

ڕوونکردنەوەکانی مامۆستا کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر ئەو گەنجانەی کە لەوێدا ئامادەبوون. چونکە باسی لەو کەشە دەکرد کە ئەوانی تێدابوون. مامۆستا عوسمان هەستی جوڵابوو، نەیتوانی ڕێ لە فرمێسکەکانی چاوی بگرێت. بەم جۆرە بەردەوام بوو لە قسەکانی:

- ئەو مرۆڤەی ڕۆژ تا ئێوارە دەبێتە بینەری دیمەنە ڕێپێنەدراوەکان و، لە کاتێکدا گلەیی لە زۆریی سەرقاڵییەکانی دەکات کە ناتوانێت بەو هۆیەوە کات بۆ کارە خێرداراەکان تەرخان بکات، کەچی لەولاوە بە چەندین کاژێر خۆی دەخاتە بەر لێشاوی پیسیی لاپەڕەکانی ئینتەرنێت و، دڵ و مێشکی بەوان بریندار دەکات و، ئامادەنییە بە فرمێسکی پەشیمانی برینەکانی دڵی سارێژ بکات، ئەو کەسە گەر ئیمانداریش بێت، هەست بە چێژی ئیمان ناکات و، بێبەش دەبێت لەوەی خەڵکانی دیکە بەو چێژە ئاشنا بکات.

ڕاستە ئەم دونیایە ڕاگوزەر و فانییە بەڵام زۆر شت هەیە کە پێویستە لێرە ئەنجام بدرێت. چونکە دواڕۆژ و مەنزڵگای ئاسوودەیی هەمیشەیی کە بەهەشتە، لە دونیادا بەدەست دێت. هەربۆیە مرۆڤی ژیر و دانا ناچێت خۆی بە شتانکی پووچەوە سەرقاڵ بکات و خۆی بخاتە پێگەی مرۆڤی بێبەهاوە.

بیر و هۆشی بە زانیاریی بێکەڵکەوە سەرقاڵ ناکات و نابێتە نێچیری تابلۆ و دیمەنە خەیاڵ شێوێنەکان و بیری خۆی بە شوێنکەوتەیی ئەو دیمەن و ڕۆژنامە و گۆڤار و کتێبانە تێك نادات کە دڵ دەکەنە ئامانج و لێوانلێون لە بەدڕەوشتی.

لەبری ئەوەی ئینتەرنێت و تەلەفیزیۆن بۆ کوشتنی دڵ و مێشکی بەکار

بهێنیت، وەك نیعمەتێکی خوایی بۆ چەندین کاروباری بەسوود و چاك بەکاریان دەهێنێت. پێغەمبەری سەرورمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێت:

"یەکێك لە ڕەوشتە جوانەکانی مرۆڤی باوەڕدار بریتییە لە دەستبەرداربوونی ئەو کارانەی کە بێسوودن و هیچ بەهایەکیان بۆ دواڕۆژی نییە."[1]

## پەروەردگارمان دەیەوێت ئێمە چۆن گەنجێك بین؟

لەم کاتەدا گەنجێکی دیکە پرسیاری کرد و وتی:

- مامۆستا! خوای پەروەردگار دەیەوێت ئێمە چۆن گەنجێك بین؟

مامۆستا عوسمانیش وتی "منیش ئێستا دێمە سەر ئەو باسە!" پاشان بەم شێوەیە درێژەی بە باسەکەی دا:

- کێشە و گرفتە کەڵەکەبووەکانی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان چاوەڕوانی گەنجانی خۆشەویستی خوان. ئاسۆی تاریکی دونیای ئەمڕۆمان پێویستی بە ڕووناکیی دڵ و دەروونی ئەو مەرد و کەڵەپیاوانەیە. ئەوانە کێن؟ خاسیەت و تایبەتمەندیی ئەو بەختەوەرانە چین؟ وەڵامی ئەم پرسیارانەش لەم فەرموودە پیرۆزەی سەروەرماندایە کە دەفەرموێت "خوای پەروەردگار ئەو گەنجەی زۆر لا ئازیزە کە مەیل و ئارەزووەکانی نێو دەروونی جڵەو دەکات و خۆی ڕادەستی ویست و حەزەکانی نەفسی سەرکەشی ناکات."[2]

لە فەرموودەیەکی دیکەی پیرۆزی سەروەرماندا هاتووە کە دەفەرموێت "خوا میهرەبانیی خۆی بڕژێنێت بەسەر یەحیای برامدا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) کاتێك

١. سنن الترمذي، الزهد، ١١؛ سنن ابن ماجه، الفتن ١٢.

٢. السيوطي، جامع الكبير، ٢٦٦٨.

منداڵ بوو و هاورێکانی بانگیان دەکرد بۆ یاریکردن، ئەو دەیوت "ئایا من بۆ یاری و گاڵتە و گەپ دروستکراوم؟"

خوای باڵادەست لە فەرموودەیەکی قودسیدا دەفەرموێت "ڕوانینی حەرام یەکێکە لە تیرە ژەهراوییەکانی شەیتان. هەرکەسێك لە ترسی من وازی لێ بهێنێت، خۆشی و شیرینییەکی وەهای ئیمان دەخەمە دڵیەوە، لە قووڵاییەکانی دڵیدا هەست بە چێژەکەی بکات."[1]

دیسان سەروەری مرۆڤایەتی لە فەرموودەیەکی دیکەدا بە عەلی کوڕی ئەبو تالیب دەفەرموێت "ئەی عەلی، لە یەکەم بەرچاوکەوتندا گوناهت ناگات، بەڵام لە دووەم نیگا نابەخشرێیت."[2] واتە کاتێك مرۆڤ بەبێ ویستی خۆی چاوی بەر دیمەنێکی نەشیاو دەکەوێت گوناهی بۆ نانوسرێت، بەڵام لە دووەم جار و دواتردا لەبەر ئەوەی ئیرادە و ویستی مرۆڤ دێتە مەیدانەوە، نەفس ڕۆڵی هەیە. ئەم نیگایەش لەبەر ئەوەی وەك یەکەم ئەڵقەی زنجیرێك کە مرۆڤ بەرەو خوار دەداتە بەر، حەرامە.

بۆیە پێویستە گەنجانی شەرەفمەند بە خۆشەویستیی پەروەردگار لەبەرامبەر ئەو دیمەنە نەشیاوانەدا بەئاگابن کە لە شاشەی تیڤی و کۆمپیوتەر و لاپەڕەکانی ڕۆژنامەدا بەرچاویان دەکەوێت و، بە ئیرادەی خۆیان بۆیان نەڕوانن. ئەوان نابێت فریوی شەیتان بخۆن و بڵێن "بە یەك جار و کەمێك هیچ نابێت."

---

١. علي المتقي، كنز العمال، ٥/٣٢٩.

٢. الترمذي، الأدب ٢٨.

## چاونوقاندن لەبەرامبەر حەرامدا چاکە دەستی مرۆڤ دەخات

لێرەدا مامۆستا عوسمان پرسیارێکی کرد:

"باشە، لەبازاڕ و قوتابخانە و شوێنی کارەکانماندا چی بکەین؟" پاشان وەڵامی پرسیارەکەی خۆی دایەوە و وتی:

- لەوێدا تەنها شت کە بکەوێتە سەر شانی ئێمە ئەوەیە مافی دەرەوە بدەین. مافی دەرەوەش بریتییە لە هەوڵدان بۆ ناساندنی خوا و پێغەمبەرەکەی.

زۆرجار هاوەڵانی ئازیز و بەڕێز بە مەبەستی باسکردنی ڕاستی دەچوونە دەرەوە و ڕوویان لە بازاڕ دەکرد. ئەوانەی بە ئامانجێکی وەهاوە دەچنە دەرەوە، پێویستە مافی ڕێگا و بازاڕ بدەن و بەو جۆرەش لە گوناهـ پارێزراو دەبن.

سەروەرمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دانیشتنی کەنار ڕێگا و شەقامەکانی لە هاوەڵان قەدەغەکردبوو. کاتێك دەیانوت "بەرژەوەندی و سود لە دانیشتنەکەماندا هەیە" ئەویش پێی دەفەرموون "کە وابوو مافی ڕێگاکە بدەن؛ لە بەرد و دڕك و داڵ پاکی بکەنەوە، وەڵامی سڵاو بدەنەوە، سڵاو بکەن و فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە بکەن و باسی ڕاستی بۆ خەڵکی بکەن."[1]

بەم شێوەیە گەر ئەم نیاز و نیەتە دڵسۆزانەیەمان هەبێت دەکرێت ئەو گوناهانەی بەدەر لە ویستی خۆمان بەرەو ڕوومان دێن بگۆڕین بە چاکە. لەوەش زیاتر هەر چاوداخستنێك لە ئاست حەرامدا بە ئەندازەی جێبەجێکردنی واجبێك چاکە دەستی مرۆڤ دەخات.

سەرەڕای هەموو هەوڵەکانی ئێمە ڕەنگە هێشتاش پیسی و لەکەی جۆراوجۆر لەملاو لاوە و بەدەر لە ئیرادەی خۆمان بێن و دڵ و ڕۆحمان

---

١. صحيح البخاري، المظالم ٢٢؛ صحيح مسلم، اللباس ١١٤.

داپۆشن. لەم بارودۆخانەشدا دەبێت خێرا بچینە ژێر داڵدەی تەوبەکردن و پەرستشەکانەوە و ڕوو بکەینە خوای گەورە، پەنا ببەین بۆ ئەو و فرمێسکی پەشیمانی بڕێژین تا لە گوناهەکانمان پاکمان بکاتەوە.

لەکۆتاییشدا پەرستشەکانمان و بەتایبەتیش نوێژەکان هۆکاری سڕینەوە و خاوێنکردنەوەی گوناهەکانمانە لە لای پەروەردگار. بە پێی فەرموودەی ئازیزمان نوێژە فەرزەکان دەبنە کەفارەت بۆ ئەو گوناهە بچووکانەی کە لەنێوان نوێژە فەرزەکاندا ئەنجام دەدرێن. بەڵێ، پشت بە خوا ئەو بەندایەتی و نوێژانەی کە ئەنجامیان دەدەین دەبن بە کەفارەت بۆ ئەو گوناهانەی کە بێویستی خۆمان دێن و سنووری ئیرادەمان تێ دەپەڕێنن.

# ”کردنەوەی پێگە نەشیاوەکانی ئینتەرنێتم کردبووە خوو“

دەروونناسێکی چارەسەرکاری خێزانی وتی:

ساڵی پار نەخۆشێکی گەنج بەشەرمەوە هات بۆ لام. لە هەموو دۆخێکیدا هەستت بە شەرمەزارییەکەی دەکرد. چەندی دەکرد نەیدەتوانی بچێتە نێو بابەتەکەوە. سەرەتا هەوڵمدا کەمێك ئارامی بکەمەوە. پاش کەمێك دەستی کرد بە باسکردنی کێشەکەی:

”سێ ساڵە هاوسەرگیریم کردووە. هاوسەرەکەمم زۆر خۆش دەوێت. تەنانەت وەك گەورەترین لوتف و بەخششی پەروەردگار بۆ من تەماشای دەکەم. بەڵام من مێردێك نیم شایەنی پاکێتیی ئەو بم.

پێش ئەوەی هاوسەرگیری بکەم نەخۆشییەکم هەبوو. سەرەتا ئەم نەخۆشییە لە مەراق و ئارەزووی بینین و زانینەوە سەری هەڵدا. دەستم کرد بە کردنەوەی ماڵپەڕە نەشیاوەکانی نێو تۆڕی ئینتەرنێت. بە تێپەڕینی کات وای

لێهات ئەمە خۆشییەکی زۆری بە من دەبەخشی. لە ناخمدا بەردەوام دەموت ”هەرچۆنێك بێت دوای هاوسەرگیری وازی لێدەهێنم“

بەڵام لەپاشدا بۆم دەرکەوت کە ئەمە لە بنەڕەتدا چەپەی شەیتان بووە. ئەم نەخۆشییەم پاش هاوسەرگیریش بەردەوامبوو. کاتێکم زانی بوومەتە دەردەدار و ئالوودەی ئەو وێنە و دیمەنە نەشیاوانە. لە شەرمدا ناتوانم ئەو کێشەیەم لای هاوسەرەکەم باس بکەم. بەڵام دەشمەوێت لەو نەخۆشییە ڕزگارم ببێت. لەبەر ئەوە هاتم بۆ لاتان تکادەکەم هاوکاریم بکەن.“

کاکی دەروونناس بەم شێوەیە بەردەوامبوو لە قسەکانی:

لە ڕاستیدا ئەوەی پێویستە لەم دۆخەدا ئەنجام بدرێت، چارەسەری دەروونییە. بە پێی ئاماژەی پێغەمبەری ئازیزمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) نابێت "شەرم"یش وەك بەشێك لە ئیمان لەبەردەم ئەمەدا ڕێگربێت.[1] چونکە ئەمە نەخۆشییەکە و لە بنەڕەتدا پێویستی بە چارەسەرە. بۆیە منیش بۆ ماوەیەك چارەسەری پێویستم لەگەڵ ئەو هاوڕێیەدا بەکارهێنا.

پێویستە خودی تاکیش کارێکی لەم شێوەیە بە هەڵەیەکی زۆر نابەجێ لەقەڵەم بدات و ئەوە بزانێت کە تەماشاکردنی شتانی نەشیاو لە میدیاکان و پێگەکانی ئینتەرنێتدا بە تایبەتی، پاش ماوەیەك تووشی ئالوودەیی دەکات. ئەم ئالوودەییەش هیچی کەمتر نییە لە ئالوودەبوون بە مادده کحولی و مادده هۆشبەرەکان، چونکە وا لە تاك دەکات چێژ لە شتە ئاساییەکانی ژیان نەبات و هەموو خۆشییەك ببەستێتەوە بەو شتە قێزەونانەوە. دواجار ئەم شتانە لە کۆمەڵگە دایدەبڕن و لەکاتی نەبوونیدا ئازاری رۆحی و جەستەیی

---

١. صحيح البخاري، الإيمان، ١٦.

پێدەگەیەنن و کەسەکە پەک دەخەن. بۆیە پێویستە هەر لەسەرەتاوە ڕوانین بۆ بچوکترین دیمەنی نەشیاو بە هەڵەیەکی کوشندە بزانرێت هەروەها خۆی لێ بەدووربگرێت. هەوڵ بدرێت کاتە خاڵییەکان بە چالاکی وەرزشی و چالاکییەکانی تر پڕبکرێتەوە و ئەو ڕێنماییانە جێبەجێ بکرێت کە پێویستن بۆ دووربوون لە نەخۆشییەکی لەم شێوەیە.

## با هەڵسوکەوتێک نەکەین لە دوارۆژدا تووشی شەرمەزاریمان بکات

پێش هەموو شتێك بابەتەکە لایەنێکی ئیمانی هەیە. پێویستە بڕواهێنان بە خوا و دوارۆژ لەگەڵ عەقڵ و ئیرادەدا یەك بگرێتەوە و کۆبەندی هەموو فەرمان و قەدەغەکراوەکانی ئیسلام بەبێ کەموکووڕی لە ژیاندا بەرجەستە بکرێن و لەو ڕێگایەوە کێشەکە تێ بپەڕێنرێت. پێویستە گرنگی بەو پڕوپاگەندە نەشیاوانە نەدەین کە ڕۆژئاوا کردوویەتییە هۆکارێکی سەرەکی لە بازرگانیی ئەمڕۆدا و، ڕێگا نەدەین کەسانی تر هەستە شەهوانییەکانمان بە هەڵدێردا ببەن. ڕێگەیەکی زۆر کاریگەریش بۆ خۆپاراستن لە ئاگری شەهوەت و دووربوون لە هەڵەی ڕوانینی حەرام بریتییە لە جێبەجێکردنی ئەو ئامۆژگارییە بەرزەی پێغەمبەری سەروەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) کە دەفەرموێت "ئەی کۆمەڵی لاوان! هەرکەس لە ئێوە گەر دەتوانێت ماڵ و حاڵ پێکەوە بنێت با هاوسەرگیری بکات، گەر ناتوانێت با بەڕۆژووبێت، چونکە ڕۆژوو دەبێتە قەڵغان بۆی" بەڵێ، ڕۆژوو قەڵغانە بۆ تاکی موسڵمان و ئیمانەکەی، توانای

ڕامکردنی خود و خستنەژێر کۆنترۆڵی هەستەکان بە مرۆڤ دەبەخشێت و ئیرادەی بەهێزتر دەکات بەرامبەر گوناهەکان.

بەم شێوەیە لەڕێی بەگوێکردنی فەرمانەکانی خوا و شوێنکەوتنی سوننەتەکانی پێغەمبەرەوەیە وامان لێدێت وەك تاکێکی موسڵمانی ڕووسپی، سەربەرزانە ئەم ژیانەمان بەسەربەرین و نەچینە ژێر باری ئەو کردەوانەوە کە لە دوارۆژ و لە ساتی کردنەوەی دەفتەری کردەوەکانمان لەبەردەم پەروەردگاری مەزندا شەرمەزارمان دەکەن.

ئەگەر ئاوا بکەین ئەوا ڕێگر دەبین لەبەردەم ئەو چێژە قێزەون و لادانە بەدڕەوشتی و پەیوەندییە قەدەغەکراو و منداڵە ناشەرعی و تەمومژە ڕۆحییانەی کە ئەمڕۆ دەرئەنجامەکانی وەك جیابوونەوە و خەمۆکی و دابڕان لە کۆمەڵگە و خۆکوشتن و هاوشێوەی ئەمانە دێننە کایەوە و، لە هەموو کاتیش زیاتر هەڕەشەن لەسەر خێزانی مرۆڤایەتی.

# ئاھ لەدەست گفتوگۆی پیاوان لەبارەی هاوسەری دووەمەوە!

بازرگانێك هەبوو کە لە بوارەکەی خۆیدا زۆر سەرکەوتووبوو. کاتێك پێش پێنج ساڵ دەستی بەم کارەی کرد بە هیچ جۆرێك چاوەڕوانیی ئەوەی نەدەکرد بگات بەم ڕۆژەی. بەڵام ئێستا ئەو خاوەن کارێك بوو کە لە شایستەترین شوێنەکان و وڵاتە جیاجیاکانی دونیادا نووسینگەی هەبوو و لەو بوارەدا بووبووە کەسێکی بەناوبانگ و ناسراو.

بێگومان لەگەڵ دەوڵەمەندبوون و گۆڕانی چواردەورەکەیدا کەسانی نوێی ناسیبوو. لە چواردەوریدا ئەو پیاو و ئافرەتانە هەبوون کە شارەزای بوارەکەیان بوون و، لانی کەم یەك زمانی بیانییان دەزانی و، وڵاتە جیاجیاکانی دونیا گەڕابوون و، جوانترین و شیکترین پۆشاکیان دەپۆشی. خۆشی لانی کەم هێندەی ئەوان گرنگی بە پۆشاك و ڕێك و پێکی خۆی دەدا.

خاوەنی پێکهاتێکی پارێزگار بوو کە لە خێزانەکەیەوە وەریگرتبوو، هاوسەرگیرییەکەشی هەر لەگەڵ کەسێکی خاوەن پێکهاتێکی وەهادا

ئەنجامدابوو. پیشە و بازرگانییەکەی کابرا وای دەخواست زۆربەی کات لە دەرەوە سەرقاڵی پێشخستنی کاروبارەکانی بێت، خێزانەکەشی زیاتر لە ماڵەوە بوو و بەڕێوەبردنی کاروباری ماڵی لە ئەستۆدا بوو، زۆری سەرقاڵییەکانی ماڵیش وای کردبوو دەرفەتێکی ئەوتۆی دەست نەکەوێت گرنگی بە خۆی بدات و خۆی نوێ بکاتەوە.

لەبەر ئەوەی کابرا لە ژینگەی کار و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیدا لەگەڵ خانمی پێکەوتوو و ڕێکپۆش و ڕۆشنبیرتردا بوو، وردە وردە خانمەکەی دوور لەو دونیایەی خۆی دەبینی. سەرەڕای هەموو شتێك، درکی بەوە دەکرد کە دەبێت پاکیزەیی و پاکێتیی خۆی بپارێزێت. بەڵام هەندێك جار بەسەر نەفسیدا زاڵ نەدەبوو. لە شوێنی کارەکەیدا هەستی بەرامبەر خانمێکی فەرمانبەری خۆی جوڵابوو. لە ناخی خۆیدا دەیوت "ئەو خانمەی کە دەبێت من هاوسەرگیریی لەگەڵدا بکەم پێویستە وەها بێت!"

ئیدی ئێواران درەنگ دەهاتەوە بۆ ماڵەوە. بەهانەکەشی ئامادەبوو: کۆبوونەوەی کاروبارەکان. کاتێکیش دەهاتەوە بۆ ماڵەوە لەگەڵ خێزانیدا دەبووە دەمەقاڵێیان. ڕۆژێکیان دیسان درەنگ هاتەوە بۆ ماڵەوە. دیالۆگێکی لەم جۆرە لەنێوانیاندا ڕووی دا:

- پیاوەکە، هەست دەکەم چیتر وەك جاران گرنگیم پێ نادەیت. دواجار کەی بوو سۆزت بۆ نواندم، لە بیرتە؟

- نەخێر، بیرم نایەتەوە.

- بێگومان بیرت نایەتەوە. خۆ من هەر ناکەومە نێو بازنەی گرنگیی تۆوە. زۆر درەنگ دێیتەوە بۆ ماڵەوە. بەیانیش زوو لە ماڵ دەردەچیت. وای

لێهاتووە کاتێك نەماوەتەوە پێکەوە لەگەڵ تۆدا بەسەری بەرین. کاتێك قسەم لەگەڵدا دەکەیت خەیاڵت لێرە نییەو لە شوێنێکی تریت. کە شتێکم پێ دەڵێیت تەنانەت سەیری دەموچاویشم ناکەیت!

- زۆرم لەگەڵ مەڵێ. تۆزێکیش لە خۆتدا بە دوای هۆکاری ئەو گازندانەتدا بگەڕێ.

## هێنانی ژنی دووەم تەنها
## بۆ تێرکردنی ئارەزوو کارێکی چۆنە؟

لە ئاکامی ئەم دەمەقاڵێیانەدا هەمیشە بابەتەکەی دەگەیاندە ئەوەی خانمەکەی بشکێنێت و بابەتی ژنی دووەم بهێنێتەوە ناوەوە.

- ئەم کارە ئاوا ناڕوات. دەبینیت، با هاوسەرگیرییەکی دیکە بەسەر تۆدا ئەنجام بدەم، ئەوکات هەم تۆ ئاسوودە دەبیت و هەم منیش...

بەڵام ئەم جارەیان ژنەکەی خۆی ئامادەکردبوو. وتاری یەکێك لە پرۆفیسۆرە بەناوبانگەکانی بواری مافەکانی ئیسلامی لەبارەی ئەو بابەتەوە خوێندبووەوە. لە لایەك دەگریا و لە لایەکی دیش دەیوت:

- دەزانیت ئەو مامۆستا بەڕێزەی کە لای تۆ قسەی ڕەوایە، دەڵێت چی؟ با وەك خۆی بۆت بخوێنمەوە: ئەو پیاوانەی بێ ئەوەی پێویستییەکی گرنگ لە ئارادا بێت، تەنها بۆ چێژوەرگرتن هاوسەرگیریی دووەم ئەنجام دەدەن، لە ژینگەیەکدا کە هەمووان لەگەڵ یەك هاوسەردا ژیان بەسەر دەبەن، پێویستە ئەو کاریگەرییە لەبەرچاو بگرن کە ئەم کارەیان لەسەر خانمی یەکەمیان و چواردەورەکەی و ئەو خێزانە جێی دەهێڵێت. دەڵێت:

"پێش هەموو شتێك، با بپرسین؛ ئایا مافی ئەوەمان هەیە تەنها لەپێناو چێژ و ئارەزووی خۆماندا خانمی یەکەممان هێندە بڕەنجێنین، بیرِوخێنین و نارِەحەتی بکەین و ئایین و ئیمانی بخەینە مەترسییەوە؟" دەبێت بەو جۆرە بیر بکەنەوە و ئەو پرسیارە لە خۆیان بکەن. پێغەمبەری ئازیزیشمان (صَلَّىٰ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) مۆڵەتی نەداوەتە حەزرەتی عەلی ژن بەسەر حەزرەتی فاتیمەدا مارە بکات و، ئەگەری کاریگەریی خراپی ئەو هاوسەرگیرییەی لەسەر حەزرەتی فاتیمە وەك هۆکاری ئەوە خستووەتە ڕوو."

دەتوانرا چی لەسەر ئەو ڕوونکردنەوانە بوترێت! باشترین شت بێدەنگی بوو. ئەویش هەر وای کرد. ئێوارەی دواتر بە دەستەگوڵێکەوە هاتەوە بۆ ماڵەوە و داوای لێبوردنی لە خانمی هاوژینی کرد.

هەروەها بەڵێنێکی لەم جۆرەشی پێدا "لەمەودوا هەوڵ دەدەم هەرگیز نەترِەنجێنم و جارێکی تر بەگاڵتەش بێت باسی ژنی دووەم نەهێنمەوە سەر زار."

# تکایە یارمەتیم بدەن،
# نامەوێت ناموسم لەکەدار بێت!

ئەو خانمێکی بێوەژن بوو. زۆری نەبردبوو کە مێردەکەی لەدەستدابوو. سێ منداڵی هەبوو. لە ماوەیەکی کەمدا ئەو پارەی تەواوبووبوو کە لە مێردەکەیەوە بۆی مابووەوە. لە دۆخێکی زۆر سەختدا بوو. بە هاوکاریی خزم و دراوسێکانی دەژیا. خۆی و منداڵەکان ڕۆژێك تێر و ڕۆژێك برسی بوون.

هەرچەندە خۆی ئارامگربوو بەڵام منداڵەکانی نەبوونییان نەدەزانی، کە برسی دەبوون دەستیان دەکرد بە ناڵە و گریان. ئەویش زۆر بەمە خەمبار دەبوو. ئای خوایە گیان، بێچارەیی چەندە سەخت بوو! دیسان منداڵەکانی دەستیان کردبوو بە گریان و دەیانوت ”دایە، برسیمانە.“ کێ یارمەتی ئەوانی دەدا؟

لەم کاتەدا لە پەنجەرەکەوە بینی تەکسییەك وەستا. کەسێك لە تەکسییەکە دابەزی. لە دڵی خۆیدا وتی ”بێگومان ئەم شۆفێری تەکسییە پارەی پێیە“، چونکە تازە سەرنشینێکی دابەزاندبوو. بەڵام دەبوو چی بکات، چۆن داوای پارەی لەو شۆفێرە دەکرد؟

ئایا شۆفێرەکە باوەڕی پێ بکردایە؟

بوێریی خۆی کۆکردەوە و وتی "خوایە گیان تکات لێ دەکەم یارمەتیم بدە." پاشان چوو تەکسییەکەی وەستاند کە لەسەر ڕۆیشتن بوو. لە جامی تەکسییەکە نزیکبووەوە و بە دەنگێکی لەرزۆك و شەرمنانەوە وتی:

- بەڕێزم، تکادەکەم بە سواڵکەرم مەزانن. لە دۆخێکی زۆر سەختدام. مێردەکەم لەدەستداوە. سێ منداڵم لە برساندا دەگرین. بێچارە ماومەتەوە. لەوە دەترسم وا بڕوات شەیتان زەفەرم پێبهێنێت و بۆ نانی ڕۆڵەکانم ناموسم لەکەدار ببێت. تکا دەکەم، بۆ ڕەزامەندیی خوا یارمەتیم بدەن. من ڕازیم بەوەی لە برسا بمرم. بەڵام بەرگەی برسێتیی منداڵەکانم ناگرم.

## بیگرە خوشکم، گرنگ ئەوەیە تۆ بە ناموسی خۆتەوە بژیت!

شۆفێرەکە لەبەرامبەر ئەم داواکارییەدا زۆر سەرسامبوو. لە ڕاستیدا خۆشی بە هەزار حاڵ بژێوی ژیانی پەیدا دەکرد. ماوەیەك هەروا مایەوە. بڕێك پارەی لە گیرفاندا بوو، بەڵام وای دانابوو بەو برە پارەیە تایەی ئۆتۆمبیلەکەی بگۆڕێت کە سەرچاوەی بژێوی و نانپەیداکردنی بوو. چەندین مانگ بوو کاری کردبوو تا ئەو پارەیە پەیدا بکات.

بێگومان لەم کاتەدا شەیتانیش بەبەتاڵی دانەنیشتبوو. خێرا ئەم وەسوەسەیەی دا بە گوێی شۆفێرەکەدا:

- تۆ خۆت پێویستیت هەیە. پێی لێدە و بڕۆ بە ڕێی خۆتەوە. بێگومان کەسێك هەر دەبێت یارمەتی ئەم ئافرەتە بدات.

شۆفێرەکە کەسێکی خاوەن ئیمان و ویژدان بوو. نەیدەتوانی لەو دۆخەدا

هاوکاری ئەو نافرەتە نەکات کە هێندە پەرۆشی عیففەت و پاکی خۆی بوو. ئەوی خستە شوێنی خوشکی گەورەی خۆی. هەموو پارەکەی گیرفانی دەرهێنا و وتی:

- فەرموو دادە گیان، گرنگ ئەوەیە تۆ بە ناموسی خۆتەوە بژیت. خوا یارمەتیت بدات.

هەر کە پارەکەی دایە دەست نافرەتەکە، بەخێرایی لەوێ دوورکەوتەوە. نەیدەویست شەرمەزاری بکات. تەنانەت ژنەکە فریا نەکەوت سوپاسیشی بکات. بەڵام لە دوایەوە پاڕانەوەیەکی وەهای بۆ کرد:

- تۆ پێویستیی منت دابینکرد، خوای گەورەش پێویستیی تۆ دابین بکات.

## با نرخ و کرێی ئەو کارەت شەفاعەتی من بێت!

کە هاتەوە بۆ ماڵەوە خانمەکەی پێی وت:

- پیاوەکە، ئەها تۆ ماوەیەك بوو بەتەمابوویت تایەی ئۆتۆمبێلەکە بگۆڕیت. ئەمڕۆ تایەفرۆشێك هات، نەیتوانیبوو خۆت بدۆزێتەوە. سبەینێ چاوەڕوانیی تۆ دەکات بچیت و تایەکانت بۆ بگۆڕێت.

هەوڵیدا دەرینەخات، بەڵام زۆر سەرسامبوو. چونکە لەگەڵ هیچ تایەفرۆشێکدا قسەی نەکردبوو. بە مەراقێکی زۆرەوە چاوەڕوانیی بەیانی کرد. هەر ڕۆژبووەوە بەرەو لای تایەفرۆشەکە بەڕێکەوت. نامۆیی ئەم بابەتە لەوەدا بوو کە تایەفرۆشەکەش شۆفێرەکەی نەدەناسی.

کە گەیشتە شوێنکاری تایەفرۆشەکە، شۆفێرەکە وتی:

- بەڕێزتان دوێنێ ئێوارە هاتوون بۆ ماڵی ئێمە، وتووتانە کە تایەکانی ئوتومبێلەکەی من دەگۆڕن، ئایا ئەمە ڕاستە؟

پیاوەکەش باوەشی پێدا دەکات و بە قوڵپی گریانەوە دەڵێت:

- تۆ ئەویت؟

دوێنێ شەو پێغەمبەری ئازیزمان (صَلَّیَ اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمْ) هاتە خەوم و پێی فەرمووم "تایەکانی ئۆتۆمبێلی شۆفێری ئەم ناونیشانە بگۆڕە. نرخ و کرێی ئەو تایە گۆڕینەش بەدەستهێنانی شەفاعەتی منە." ئێستا لەبەر ڕەزامەندیی ئەو خوایە بە من بڵێ. تۆ چ جۆرە چاکەیەکت ئەنجامداوە وا سەروەرمان تەشریفی هێنایە خەونی منەوە و داوای لێکردم یارمەتیت بدەم!

# لەبەر ئەوەی براژنەکەی لەماڵەوە بەتەنها بوو، نەدەچووەوە بۆ ماڵەوە

دۆستێکم بۆی گێڕامەوە:

کە لە قۆناغی ئامادەییدا بووم هاوڕێیەکم هەبوو. ئەم هاوڕێیەم کەسێکی زۆر بەئەدەب و پاکداوێن بوو. کە بە ڕێگادا دەڕۆیشت سەری هەڵنەدەبڕی و لە چواردەوری نەدەڕوانی، بەردەوام سەیری پێش خۆی دەکرد و بەو شێوازە ڕێی دەکرد.

جارێکیان لەپشتەوە لێی نزیکبوومەوە و دەستم خستە سەر شانی. تا ئێستاش ئەو ئاوڕدانەوە و تێڕامانەیم لەیادە.

چاوانێکی مەست وەك ئەوەی تازە لە خەو هەستابێت، بە ڕوانینێکەوە کە ئارامی و ئاسودەیی و دڵنیایی لێ دەباری تەماشای کردم، بە جۆرێك ئەو تەماشاکردنەی لە قووڵاییەکانی ڕۆحمدا کاریگەریی خۆی بەجێهێشت.

ئەم هاوڕێیەم دەچوو بۆ خولی خۆئامادەکردن بۆ زانکۆ. ماڵەکەیان قەرەباڵغ بوو. برا گەورەکەی هاوسەرگیریی کردبوو و لەسەر ماڵ لەگەڵ

دایك و باوکیدا بوو. دایك و باوکی ڕۆیشتبوون بۆ عەمرە. براکەی کاری دەکرد و ئێواران کاتژمێر ٨-٩ دەهاتەوە.

ئەم هاوڕێیەش بەیانی زوو لەگەڵ باوکیدا لە ماڵ دەردەچوون، دەچوو بۆ کۆرسەکەی و دەمەوئێوارە نزیکی کاتژمێر ٤ - ٥ دەگەڕایەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی براژنەکەی لە ماڵەوە بەتەنها بوو، ئەم نەدەچووەوە بۆ ماڵەوە، یەکسەر ڕێگای مزگەوتی دەگرتە بەر. تا ئەو کاتەی براکەی دەهاتەوە کاتەکەی بە نوێژکردن و قورئانخوێندن و کۆششکردنی وانەکانییەوە بەسەر دەبرد.

## کە بە ڕێگادا دەڕۆیشت سەری دادەخست

هاوڕێیەکی تریشم بە هەمان شێوە کە بە ڕێگادا دەڕۆیشت نەیدەویست تەماشای چواردەوری خۆی بکات، بۆیە بەردەوام سەری دادەخست. لەبەر ئەوە بەردەوام بەغیبتەوە بیرم دەکردەوە و دەموت: لەناو مرۆڤەکاندا مرۆڤی ژیر ئەو کەسەیە کە یەکسەر دوای ئەنجامدانی هەڵەیەك تەوبە دەکات و بەردەوامی و پێداگری لەسەر هەڵەکەی ناکات. بەڵام لەو ژیرتریش ئەوەیە کە دوور دەکەوێتەوە لەو ناوچەیەی هەڵەکەی تیادا ڕوو دەدات. واتە لەبری ئەوەی پاش شکاندنی کریستاڵەکە بەجوانی پێکەوەی بنێتەوە، بە دوای ڕێگای نەشکاندنی کریستاڵەکەدا دەگەڕێت.

بەڵێ، ئەم هاوڕێیەی من هەر لە سەرەتاوە خۆی لە ڕوانینی حەرام دەپاراست و ڕێگریی دەکرد لەوەی کە دڵی بریندار بێت. چونکە ئەگەرچی مرۆڤ لە دوای ئەنجامدانی گوناهـ تەوبەش بکات، ئەو گوناهە لە دڵیدا هەر ئاسەوار و برینداریيەك بەجێ دەهێڵێت و ڕەنگە زەمینە بۆ دووبارەکردنەوەشی

ساز بدات. لەبەر ئەوە ژیرانەترین هەڵوێست ئەوەیە هەر لە سەرەتاوە دەرگا لەسەر گوناهەکان دابخرێت.

خوا هەندێك هاورێشی پێ بەخشیوم کە هەر ئەوانم بە بیردا دێتەوە حەسرەتێك دامدەگرێت و لە تامەزرۆییدا ئێسکی لوتم دەزریکێنێت و قورگم پڕ دەبێت لە گریان. ئەمانەش پاڵەوانەکانی خولگەی پاکێتی و پاکیزەیین. هەرگیز بیر لە بەرژەوەندیی کەسی خۆیان ناکەنەوە. چاوەڕوانی هیچ شتێك لە کەس ناکەن. ژیانی ئەم تابلۆیانەی نەفسبەرزی و چاوتێری هەردەم لەسەر نەگۆڕیی چاکەکارییە.

ئەگەرچی بارودۆخی خۆیان نالەباریش بێت، بەڵام هەر دەست لە یارمەتیدانی ئەوانی دی ناگێڕنەوە و، پێویستییەکانی خۆیان پشتگوێ دەخەن. حەز ناکەن دۆخی خۆیان بۆ ئەوانی تر باس بکەن. ئارام لەسەر هەموو پێشهاتەکان دەگرن و سوپاسگوزارن بۆ حاڵیان. ئەوانەش قارەمانانی دیوێکی دیکەی عیففەت و پاکیزەیین. خوای گەورە بەو جوانییەوە کە خۆی پێی ڕازییە عیففەت و پاکیزەییمان دەست بخات.

# بەنرخترین دارایی خانمێک پاکیزەییەتی، کچەکەم!

"بەرفین" دۆخێکی زۆر شپرزەی هەبوو. دەچوو بۆ کۆلێژ بەڵام درەنگ کەوتبوو. تازە لە باڵەخانەکە هاتبووە دەرەوە کە چاوی چووە سەر خەدیجە و نیهالی پەرستار، بینی ئەوان لەوبەری ڕێگاکەوە بەرەو ڕووی دەهاتن. خەدیجە هاوڕێیەکی نزیکی بوو. نیهالی پەرستاریشی بەو ئەندازەیە دەناسی کە خەدیجە بۆی باسکردبوو، بەڵام خۆشی نەدەویست. چونکە پێی وابوو مێشکی خەدیجە دەشواتەوە و دەبێتە هۆکار بۆ ئەوەی بیگۆڕێت و لە ژینگەی هاوڕێکانی دووری بخاتەوە.

لەبەر ئەوە لە خەدیجەش تووڕەبوو. ئیدی ڕووبەڕووبووبوونەوە. بەرفین وتی "گەر سڵاو نەکەم عەیب دەبێت." بە شێوازێکی گاڵتەجاڕی وتی:

- وای وای! کێ دەبینم؟ کام ڕەشەبا ئێوەی هەڵدایە ئێرە؟ بریا پێش ئەوەی هاتبان قسەتان بکردایە، بەڵام دەبێت فریای وانەکەم بکەوم، ببورن.

- سڵاو بەرفین! هیوای وانەی باشت بۆ دەخوازم گیانەکەم! ئێمە بۆ لای

تۆ نەهاتبووین، هاتین سەردانێکی دایە پاکیزە بکەین کە لە باڵەخانەکەی تەنیشتتان دادەنیشێت.

- هاوار لە دەست تۆ، چیت داوە لەو پیرەژنە؟ تا کات بەسەربردن و خۆشی بینین لەگەڵ هاوتەمەنەکانی خۆتدا وەستابێت، دانیشتن لە لای ژنێکی پیری دەست و ڕوخسار چرچ و لۆچ کە ئارەزووی خۆشیی نەماوە، ڕۆحت تەنگ ناکات؟

- نـــااا، تەواو پێچەوانەکەیەتی بۆ ئەوە دەچمە سەردانی دایە پاکیزە تا ئاسودە ببم و وەڵامم بۆ ئەو پرسیارانە دەست بکەوێت کە ڕۆحم تەنگ دەکەن.

نیهالی پەرستار کە بەرەو پێش دەڕۆیشت و تێکەڵ بە قسەکانی ئەوان نەدەبوو، تا بەردەم دەرگای باڵەخانەکەی دایە پاکیزە ڕۆیشت. زەنگی لێدا.

## بەخێرهاتن، کچەکانم!

بەرفین ماڵئاوایی لە خەدیجە کرد و بە هەنگاوی خێراوە بەرەو وێستگەی پاسەکان کەوتەڕێ. خەدیجەش هات بۆ لای نیهالی پەرستار و پێکەوە بەرەو نهۆمی ماڵەکەی دایە پاکیزە سەرکەوتن. دوو هاوڕێکە خەریکبوون پێیان دەنایە سەر دوا پلیکانە و دەرگاکە کرایەوە، دایە پاکیزە بە لەچکە سپییەکەیەوە لە دەرگاکەوە دەرکەوت.

- بەخێرهاتن، کچەکانم بەخێرهاتن، چەندە کارێکی باشتان کرد کە هاتن، فەرموون.. فەرموون..

- سڵاو دایە پاکیزە، سڵاو..

پێكەوە چوونە ژوورەوە. خەدیجە پرسیارێكی هەبوو كە دەیویست لە دایە پاكیزەی بكات. پێش ئەوەی پرسیارەكەی بكات دایە پاكیزە وتی:

- كچەكانم، چای لەسەر تەباخەكەیە. تازە لێم ناوە. لەپێشدا با چایەكان بهێنم، دواتر گفتوگۆی خۆمان دەكەین.

چایەكان لەگەڵ ئەو كولیچە بەتامانەدا كە دایە پاكیزە بە دەستەكانی خۆی دروستی كردبوون هاتن.

خەدیجە یەكسەر چووە ناو باسەكەوە. تازە بووبوو بە باڵاپۆش، كۆمەڵێك گرفتی بۆ هاتبووە پێش. دەیویست ئەو گرفتانە لەگەڵ دایە پاكیزەدا باس بكات:

"دایە پاكیزە! هەرچەند دەكەم هاورێكانم لەگەڵ ئەم گۆڕانكارییانەدا رانایەن كە لە مندا ڕووی داوە، ناشیانەوێت ڕابێن. لە هەمان كاتدا دەمشكێنن و گاڵتەشم پێ دەكەن. بەلاقرتێییەوە لە جل و پۆشاك و شێوازی ژیانم دەڕوانن. من نازانم لەم دۆخەدا چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا بكەم. لەم بارەیەوە چ ئامۆژگارییەكم دەكەن؟"

## ئایینەكەمان زۆر گرنگی بە پاكداوێنی ئافرەت دەدات

دایە پاكیزە، بە دڵ و گیان گوێی بۆ قسەكانی خەدیجە گرت. زەردەخەنە و گەرموگوڕییەكەی سەر ڕوخساری هیچ بزر نەدەبوو. بە دەستەكانی دەستی بە پشتی خەدیجەدا هێنا و بە دەنگێكی وەهاوە كە دونیای ڕۆحی ئەوی دەهێنایە لەرزە وتی:

- خەدیجەکەم، کچە جوانەکەی من! خۆت باش دەزانیت کە هەموو نیعمەت و بەخششێك نرخێکی هەیە. ئەو سوکایەتی و گاڵتەکردنەی هاوڕێکانت تاقیکردنەوەیە بۆ تۆ. پێش هەموو شتێك لەم دۆخانەدا ئەوەی دەبێت بیکەیت ئارامگرتن و پەنابردنە بۆ خوا.

کچە شۆخ و شەنگەکەم! لەبیرت نەچێت کە بەنرخترین و بەبەهاترین دارایی خاتونێك پاکیزەییەکەیەتی. پاراستنی ڕێز و شکۆی ئافرەت لە سایەی پاکیزەیی و پاکێتییەکەیدا دەبێت. ئایینە مەزنەکەمان گرنگییەکی زۆری بە پاکداوێنی ئافرەت داوە.

بۆ نموونە، حەزرەتی مریەمی دایکمان لە قورئانی پیرۆزدا پەسن کراوە و ناوی ئەو لە ٣٤ شوێندا هاتووە. ئەوەش ڕێزێکە بە جۆرێك هیچ ئافرەتێکی دیکە هێندەی ئەو ناوی لە قورئانی پیرۆزدا نەهاتووە. ئەمەش نیشانمان دەدات کە ئەو شتەی بەها دەداتە ئافرەت داوێنپاکییە، داوێنپاکییە، داوێنپاکییە. دایکمان حەزرەتی فاتیمە ناو و پەسنێکی دیکەی هەیە ئەویش "بەتول"ە بە واتای ئەوەی هەمیشە پاکە و خاوێنە.

خۆداپۆشین وەك قەڵغانێکە بۆ ئافرەت کە لە ڕووی جەستەیی و ڕۆحی و دەروونییەوە دەیپارێزێت. ئەو ئافرەتە بەویقارەی کە بەڕێکوپێکی خۆی دادەپۆشێت و، پارێزگاری لە پاکداوێنیی خۆی دەکات، بە درێژایی ژیانی بە سەربەرزی و ویقارەوە، وەك نموونەیەکی داوێنپاکی دەژی. پێغەمبەری سەروەرمان بەم شێوەیە باسی ئەو نرخ و بەهایەمان بۆ دەکات کە ئیسلام بە خانمی چاکەکار و دروستی داوە "بەهەشت لەژێر پێی دایکاندایە."[١]

---

١. النسائي، الجهاد ١٢.

دایكێك كە نموونەی فەزیلەتە و لەپاڵ بارودۆخە دژوار و ماندووكەرەكانی وەك دووگیانی و منداڵبوون و شیردان و پەروەردەكردنی منداڵدا ئەركی رێكخستنی كاروباری ناوماڵیشی لەئەستۆ گرتووە. شایەنی ئەوەیە بە خۆشەویستییەكی فراوان و رێزێكی قووڵەوە بە درێژایی تەمەن سوپاسی بێپایانی پێشكەش بكرێت.

ئایا هیچ دروستكراوێكی دیكە هەیە هاوتای دایكمان ماوەیەك لە جەستەیدا و، ماوەیەك لە ئامێزیدا و، تا مردنیش لە دڵیدا ئێمە هەڵبگرێت؟!...

فەرمانی داپۆشراوی لە لایەكی دیكەشەوە دەركەوتەیەكی گرنگی ئەو پێگە و بەها بەرزەیە كە ئیسلام دەیداتە ئافرەت. چونكە گەنجینە بەنرخەكان بە چاكترین شێوە پارێزگارییان لێ دەكرێت؛ ناخرێنە بەر چاوی تەماحبار و دزەكان. ئیدی بەم شێوەیە ئافرەتی موسڵمان لە سایەی خۆداپۆشیندا و بە هۆی ئەو بەها بەرزەوە كە پێی دەبەخشرێت، لە كاریگەریی زبر و بێزراوی روانینی بێگانەكان دەپارێزرێت. یەكێك لە گەورەترین حیكمەتەكانی داپۆشراویش ئەمەیە.

## دایكێكی چەندە چاكت پێ بەخشیوم!

خەدیجەش كە هەر بەكۆرپەیی دایكی لەدەستدابوو، میهری دایكی خۆیی لە دایە عیففەتدا هەست پێ دەكرد. دەیویست تێر تێر ماچی دەستی دایە عیففەت بكات، پێی بڵێت ”دایە“ و لەئامێزی بگرێت.

كات زۆر زوو تێپەڕیبوو. ناچاربوون بگەڕێنەوە بۆ ئەو ماڵەی كە لێی دەمانەوە. نیهالی پەرستار بە وەبیرهێنانەوەی تێپەڕینی كات داوای ڕوخسەتی

کرد. هەستان. تا هاتنە بەر دەرگاکە ئەو فرمێسکانەی لە چاوی خەدیجە دەهاتنە خوار ڕوومەتەکانی تەڕکردبوو.

کاتێك لەگەڵ دایە عیففەتدا یەکتریان لەئامێزگرت، بەتوندی باوەشی پێداکرد، هەستەکانی خۆی بەهەنسکەوە لەم ڕستە ئەفسوناوییەدا دانا:

- دایکە! دایە گیان!

دواتریش سوپاسی خوای پەروەردگاری کرد و وتی:

- خوایە گیان سوپاس بۆ تۆ!.. دایکێکی چەند چاکت پێ بەخشیوم!

# تۆ ئەو "عیصمەت"ەمانیت کە لەبەرامبەر ئاسیادا ناچەمیتەوە!

دۆستێکی دیم دەیگێڕێتەوە:

کاک "عیصمەت" ئەو ساڵەی کە زانکۆی تەواوکرد ڕاستەوخۆ ڕێگای ئاسیای ناوەڕاستی گرتەبەر. دایکی بەتەنها بوو. ئەم هێشتا تەمەنی یازدە ساڵان بوو کاتێك باوکی لە دونیادا بەتەنها جێی هێشتبوون. دایکی سەرەڕای ئەوەی زۆری پێویست بە کوڕەکەی بوو، پێ بە جەرگی خۆیدا نا و تاقەکوڕەکەی بۆ شوێنێك بەڕێکرد کە تەنانەت ناویشی نەبیستووە.

مامۆستا عیصمەت لە یەکێك لەو قوتابخانانەدا کە تازە کراونەتەوە وەك مامۆستای ئەدەبیات دەستبەکاربوو. لە ماوەیەکی کەمدا لەگەڵ شارە نوێیەکەیدا خۆی گونجاند و ڕاهات. تەنانەت دواتر توانی بە شێوازێکی ڕەوان و پاراو بە زمانەکەیان قسە بکات. گەنجێکی کەشخە و ڕێکوپێك بوو. لەنێو هاوڕێکانیدا بە "یوسف" ناو دەبرا.

ڕۆژێکیان مامۆستایەك دێت بۆ ئەو قوتابخانەیەی کە ئەم مامۆستایی

تێدا دەکرد. ئەم مامۆستایە ناوی "ئاسیا" بوو. بە هەموو دۆخێکییەوە دیاربوو کە خوێندنێکی باشی خوێندبوو. کەسێکی خاوەن بنەماڵە و پێکەوتووبوو. باوکیشی یەکێکبوو لە وەزیرەکانی ئەو وڵاتە.

ئاسیا پێش دوو ساڵ هاوسەرگیرییەکی نابەدڵی ئەنجامدابوو. چەندی کردبوو نەیتوانیبوو ئەو بەختەوەرییە بدۆزێتەوە کە بە دوایدا وێڵ بوو. لە یەکەم ڕۆژەوە کە هاتبووە ئەو قوتابخانەیە هەستێکی نهێنیی شەیدایی بەرامبەر مامۆستا عیصمەت بۆ دروستبووبوو. مامۆستا عیصمەتیش کە درك بە ئەمە دەکات هەرچەند هەوڵ دەدات لە دڵی خۆیدا بڵێت "لە مەرد ناوەشێتەوە. ئەو ژنێکی شوکردووە، ئەم مرۆڤانە باوەشیان بۆ ئێمە کردووەتەوە، لەسەر دڵیان دایان ناوین، ڕۆڵەکانیان ئەمانەتی دەستی ئێمە کردووە، ناتوانم ئەم کارە بکەم." بەڵام بڵێسەی ئاگری ناخی ئەویش ڕۆژ بە ڕۆژ پەرە دەسێنێت.

ئاسیا پارچەیەکە لە ئاگر. ڕۆژێکیان وەك هەموو ڕۆژەکانی دیکە زەنگی کۆتا وانە لێ دەدات. کەس لەقوتابخانەکەدا نامێنێت. مامۆستا عیصمەت بەتەنها لە ژوورەکەی خۆیدایە. لە ڕاڕەوەکەوە دەنگی تەپەی پێ دەبیسترێت. ئەوەی کە دێت ئاسیایە. دەرگاکە دادەخات. پشتی بە دەرگاکەوە دەدات. سەرنجی چاوە گەورە و ڕەشەکانی دەخاتە سەر مامۆستا عیصمەت و دەڵێت:

- سەیرکە عیصمەت! ئیتر بەرگە ناگرم. دەمەوێت لێم تێ بگەیت و ڕەتم نەکەیتەوە. بەبێ تۆ ژیانم نییە. خۆت دەزانیت باوکم..! تا ئەمرۆ هەر شتی جوان ڕوی داوە لێرە، نامەوێت ئەمانەتان تێك بچێت و ئێرەتان لێ ببێتە زیندان.

مامۆستا عیصمەت بێچارەیە. ئاگر لە ڕوخساری دەبارێت. سوور سوور دەبێتەوە. وتەکەی حەزرەتی یوسفی بە بیردا دێتەوە کە دەفەرموێت:

﴿ قَالَ رَبِّ ٱلسِّجۡنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِۖ وَإِلَّا تَصۡرِفۡ عَنِّي كَيۡدَهُنَّ أَصۡبُ إِلَيۡهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴾ (یوسف: ٣٣)

خوایە! زیندان لەو شتە باشترە کە ئەم ئافرەتانە منی بۆ بانگ دەکەن. خۆ ئەگەر لە فێڵ و تەڵەکەی ئەوانە ڕزگارم نەکەیت و پیلان و نەخشەکانیان دەربازم نەکەیت و لام نەدەیت، لەوانەیە منیش مەیلم بۆ دروست ببێت و ئارەزوویان بکەم پاشان بچمە ڕیزی نەفام و گوناهبارانەوە.

## خوایە گیان پێویستیم پێتە، تکایە یارمەتیم بدە!

بەڕێزترین و بەبەهاترین لایەن لە ئافرەتدا پاکیزەیی و داوێنپاکییەتی، بەڵام ئیدی ئاسیا تێکچووبوو؛ ویستی بوێریی خۆی بخاتە گەڕ و شتێك بڵێت. کە دەرگاکە کرایەوە ئەوەی کە هاتبوو مێردەکەی ئاسیا بوو. هاتبوو هاوسەرەکەی بباتەوە. مامۆستا عیصمەت هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا. پەرتوکەکانی کۆکردەوە و ڕۆیشت.

بە هەنگاوی خێرا ڕۆشتەوە بۆ ماڵەکەی. جەستە ماندووەکەی فڕێدایە سەر پێخەفەکە و بەدەم هەنسکی گریانەوە بیر و باوەڕەکانی خۆی دەهێنایەوە یاد:

"مرۆڤ بە هەست و عەقڵی کۆچ دەکات، بەڵام لەو شوێنەدا کە بۆی دەچێت بە پاکیزەییەکەی لق و پۆپ دەردەکات و دەمێنێتەوە. لەم جێیەدا کە بەدەست بێمتمانەییەوە دەناڵێنێت، دەبێت ئێمە ببینە نمایندەی متمانە."

لەم کاتەدا وتەکانی یەکێك لەو زانایانەی بیرهاتەوە کە کاتێك خوێندکاری زانکۆ بوو گوێی بۆ ڕادێرابوون.

''گەنجە خۆشەویستەکان! کاتێك من لە مەدینە بووم، گەنجانی خوێندکاری زانکۆ هاتبوون بۆ لای بەڕێز "موستەفا صادق" کە یەکێکە لە ئەدیبەکانی دونیای عەرەبی، ئەویش بەوانی دەوت ''ئێوە لەناو بڵێسەی ئاگردان بەڵام ناسوتێن'' هەمیشە نزا دەکەم و دەڵێم ''پەروەردگارا! تۆ بڵێیت ڕۆژێك لە ڕۆژان وڵاتەکەی منیش ببێتە خاوەنی گەنجانی نموونەی پاکداوێنی؟!''
ئێستا کە ئێوە دەبینم نزاکانم گیرابوون و سوپاسی پەروەردگارم دەکەم!''

ئیدی شەو داهاتبوو. نوێژی خەوتنانی کرد. لەدوای نوێژەکە دەستی کرد بە نزا و وتی ''خوایە گیان پێویستیم بە تۆیە، تکایە یارمەتیم بدە، دەستم بگرە، ئەگەر تۆ دەستم نەگریت من دەکەوم خوایە گیان!''

ئەو شەوە لە خەویدا حەزرەتی یوسفی بینی. هەر کە ئەوی بینی یەکسەر ناسییەوە. لە خەوەکەیدا پێی وت ''تۆ حەزرەتی یوسف (عَلَيْهِ السَّلَام) نیت؟'' ئەویش فەرمووی ''تۆیش ئەو "عیصمەت"ی ئێمەیت کە لەبەرامبەر ئاسیادا ناچەمیتەوە!'' ئیدی بۆ ڕۆژی دوایی کە ڕۆیشت بۆ قوتابخانە زەردەخەنەیەکی بێکۆتا لەسەر لێوەکانی بوو.

زریانەکانی دوودڵی دامرکابوونەوە. هەر کە لە دەرگای قوتابخانە چووە ژوورەوە سکرتێرەکە پێی وت کە بەڕێوەبەر بانگی دەکات. کە چووە ژووری بەڕێوەبەر هەستی بە ساردییەك کرد لە هەڵسوکەوتەکانیدا. کار لە کار ترازابوو.

گێژەڵوکەیەکی بوختان لە ناو قوتابخانەکەدا هەموو شتێکی تێك دەدا و دەیسوتاند. مۆڵەتی وەرگرت و ڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوە. خەریکبوو شێت دەبوو. چاوەڕوانی بوختانێکی وەهای لە ئاسیا نەدەکرد. ویژدانی زۆر ئاسوودە بوو. نەکەوتبووە گوناهەوە بەڵام هاوڕێکانی و قوتابخانەکەی کەوتبوونە بارودۆخێکی دژوارەوە.

## ئێوە نەهاتوون گوڵەکانی پاکیزەیی وشک بکەن، بەڵکو هاتوون بۆ ئەوەی بیانژیێننەوە.

بڕیاری ئەوە دەدات واز لە قوتابخانەکە بهێنێت. بڕیاری وازهێنانەکەی ئەو ئاسیا وێران دەکات. ئاسیا کە دەیویست بەدەستی بهێنێت، ئێستا بەتەواوی لەدەستی دەدات. دواجار ڕۆژی ماڵئاوایی هات. هاوڕێکانی هاتبوونە فڕۆکەخانە تا بەڕێی بکەن. لەپڕ کەمێك لەولاوە جموجوڵێك ڕوودەدات. کاکی بەڕێوەبەر و ئاسیا و هاوڕێکانی... ترس و شڵەژان ناخی مامۆستا عیصمەت دادەپۆشێت.

ئاسیا بەڕاکردن دێت:

- کاك عیصمەت، من هەموو شتێکم باسکرد، ئیدی هەمووان ڕاستییەکان دەزانن. تکایە بمبەخشن، من لە ئێوە تێنەگەیشتبووم. واز لە ئێمە و خوێندکارەکانمان مەهێنن. تکا دەکەم، ئەم جارە لەمن تێ بگەن، گەردنم ئازاد بکەن، لێم ببورن!

مامۆستا عیصمەت هەستی زۆر دەجولێت بەڵام گەڕانەوەی مەحاڵە. دڵی لەنێو ئاگردایە. بەردەوامیش ئەگەری هەڵپڕژانی ئاگرەکە بە چواردەوردا لە ئارادایە.

- زۆر باش لە ئێوە تێ دەگەم، دەرکەوتنی ڕاستییەکان منی بە ناوی قوتابخانەکەم و هاوڕێکانمەوە زۆر دڵخۆشکرد، بەڵام تکایە ئێوەش لە من تێ بگەن، دەبێت بڕۆم!

کاتی فڕینی فڕۆکەکە هاتبوو. ئەوانەی تێگەیشتن کە پێداگری سوودی نییە، نەیاندەتوانی ڕێ لە فرمێسکەکانیان بگرن. لە ڕاستیدا ئاسیا دەیزانی کە ئەو ناگەڕێتەوە.

پاکی هەموو شتێکی مرۆڤی مەردە و، دەست لە پاکێتیی مامۆستا عیصمەت درابوو. ئاسیا نامەیەك دەدات بە مامۆستا عیصمەت تا لەناو فرۆکەکەدا بیخوێنێتەوە، لە نامەکەدا ئەم وتانە نوسرابوون:

"مامۆستا عیصمەتی خۆشەویست! تێگەیشتم کە ئاگری عەشقێکی قەدەغە، هەموو باخچەی گوڵەکان دەکاتە خۆڵەمێش. ئێوە شۆڕەسوارانی پاکیزەیین، پێ بە هەموو دونیادا دەنێن بەڵام پێ بە گوڵێکدا نانێن. ئەمەتان فێری من کرد. ئێوە نەهاتوون گوڵەکانی پاکیزەیی بژاکێنن، بەڵکو هاتوون بیانژیێننەوە. ئێمە لە ڕێگا ئاگرینەکاندا دەسوتێین، بەڵام دەتوانیت لەوە دڵنیا بیت کە گوڵەکان ناسوتێن! گوڵەکان ناسوتێن!"

# ئایا ئەو خوایەی کە هەرگیز ناخەوێت، ئێمە نابینێت؟

گەنجێکی قۆز بوو. هێشتا زگورد بوو. بە مەبەستی کار زوو زوو دەچووە دەرەوەی وڵات. هەندێك جاریش گەشتی دەرەوەی وڵاتی لەگەڵ هاوکارەکانیدا دەکرد. لە شوێنی کارەکەیدا گرفتاری خانمێك بووبوو لە هەموو دەرفەتێکدا دەیخستە ژێر ڕێژنەی نیگاکانییەوە.

ڕۆژێکیان سەرکارەکەیان بانگی کردە لای خۆی. دیسانەوە دەبووایە بۆ کارێك بچێتە دەرەوەی وڵات، سەرکار ئەو فەرمانبەرانەشی دیاریکردبوو کە لەگەڵیدا دەچوون، لەنێویاندا ئەو خانمەش هەبوو کە ئەم دڵی پێوەی بوو. زۆری پێ خۆش بوو. وەکو ئەوە بوو هەموو دونیا هی ئەو بووێت. بە دڵ و بە گیان چاوەڕوانی ئەو ڕۆژەی دەکرد.

لە دوای فڕینێکی دوورودرێژ دواجار گەیشتنە ئەو وڵاتەی کە بۆی دەچوون. یەکسەر چوون بۆ ئوتێل. زۆر ماندووبووبوون. پێویستی دەکرد پشوو

بدەن. پاش ماوەیەك هەمووان چووبوونە ژوورەکانیان و نوقمی خەو بووبوون، بەڵام ئەو نەخەوتبوو.

لە دوای خەوتنی هاوڕێکانی چووە بەردەم دەرگای ئەو ژوورەی کە کچە گەنجەکەی لێ دەمایەوە. بە پەرۆشییەکی زۆرەوە لە دەرگاکەی دا. کچەکە دەرگاکەی کردەوە. لە ڕوخساردا ناناسوودەییەکەی دەخوێنرایەوە. بە پیاوە گەنجەکەی وت:

- تەماشا بکە، بزانە هەمووان خەوتوون؟

کوڕەکە ئەم دەستەواژەیەی وەك نیشانەیەك بۆ ڕامبوونی کچەکە خوێندەوە و لە وەڵامدا وتی:

- بەڵێ من یەك یەك تەماشام کرد، لە ئێستادا هەمووان نوستوون.

پاشان کچەکە ئەم پرسیارە دڵهەژێنەی کرد کە کوڕەکە هەرگیز چاوەڕوانی نەدەکرد:

- ئەی ئەو خوایەی کە ئێمەی دروستکردووە و بە هەموو حاڵێکمان بینایە، ئایا ئەویش نوستووە؟

کابرا لە وەڵامدا وتی:

- گاڵتە دەکەیت؟ ئایا خوا هەرگیز دەخەوێت؟ بێگومان ناخەوێت!

کچەکە ئەو وەڵامەی دەستکەوتبوو کە چاوەڕوانی دەکرد. بۆیە بە کوڕەکەی وت:

- ئەگەر ئێستا هیچ کەسێکیش نەمانبینێت، ئەو خوایە دەمانبینێت کە هەرگیز ناخەوێت. دەبێت ئێمە لە بنەڕەتدا لەو بترسین!

پیاوە گەنجەکە کە لەبەرامبەر ئەم قسانەی کچەکەدا موچڕکەی پێدا هات، هەستی بە پەشیمانی کرد، داوای لێبوردنی لە خانمەکە کرد و گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی خۆی. لە ژوورەکەشیدا بیری لەوە دەکردەوە کە لە ڕاستیدا پێویستە داوای لێبوردن لە پەروەردگاری مەزن بکات. تەوبە دەکات و، بۆ ئەوەی لێی ببورێت تا بەرەبەیان پەشیمانی دەردەبڕێت و لە خوای گەورە دەپاڕێتەوە.

# من یوسفم، لە بەهەشتدا دەبیتە دراوسێی من!

ئەو گەنجێکی هەرزەکاری قۆز و کەشخە بوو کە ئیشی چاککردنەوەی بەلوعەی دەکرد. کچە گەنجەکانی گەڕەك شەیدای بوون. بەڵام ئەو هەرگیز دەستبەرداری پاکیزەیی خۆی نەدەبوو.

ڕۆژێك زەنگی تەلەفۆنی ئەو دوکانە لێیدا کە ئەو کاری تێدا دەکرد. ژنێك بوو کە دەیوت بەلوعەکانی ماڵیان تێکچوون و دەیویست ئەو بچێت بۆیان چاك بکات.

گەنجەکە ناونیشانی لە ژنەکە وەرگرت و چوو بۆ ماڵیان. نیازی ژنەکە خراپ بوو. گەنجەکە درکی بەوە کرد. ژنەکە لەناکاو بەخێرایی دەرگاکەی کلیلدا و کلیلەکەی شاردەوە، پاشان نیازی خۆی بۆ ئەو ئاشکرا کرد.

گەنجەکەیش بەو داوا خراپەی ئەو ڕازی نەبوو. ژنەکە پێداگریی کرد. بە گەنجەکەی وت:

- ناچاریت بە داواکەم ڕازی بیت. گەر دەتەوێت ڕازی مەبە. بە هەرچی

هێزم هەیە هاوار دەکەم و هەموو باڵەخانەکە دەهێنمە ئێرە. دەڵێم دەستدرێژیی کردووەتە سەرم و شەرمەزاری هەموو ئەم گەڕەکەت دەکەم. بە جۆرێك نەتوانیت لەناو خەڵکدا سەرت بەرز بکەیتەوە.

گەنجەکە وتی:

- باشە، قەبووڵمە بەڵام ڕوخسەتم بدە تا تەوالێتەکە دەچم و دەگەڕێمەوە.

ژنەکە قاقایەکی بێشەرمانەی لێدا و وتی:

- ئاوا! وەرە ژێر بار.

## بڕۆ نامەویت هەر بتبینم!

گەنجەکە چوو بۆ تەوالێتەکە. لەوێدا کارێکی وەهای کرد کە مێشکەکانی دەوەستاند. لە پیسی ناو تەوالێتەکەی سوی لە دەست و دەموچاو و جل و بەرگەکەی بەری و پاشان هاتەدەرەوە. ژنەکە کە ئەوی لەو بارودۆخەدا بینی بێزی لێی هاتەوە و خەریکبوو بڕشێتەوە. خێرا دەرگاکەی کردەوە و پێی وت:

- خێرا ملت بشکێنە و لێرە بڕۆ پیاوی قێزەون. نامەوێت هەر بتبینم.

بەم شێوازە لە ماڵەکەی دەریکرد.

بەڵێ، ئەو گەنجەی کە لە جێی گڕی بڵێسەداری دۆزەخ پیسیی دونیای زۆر بەلاوە ئاسایی بوو، بە خۆدووچارکردن بە کەمێك پیسی، لە پیسییەکی زۆر گەورەتر ڕزگاری بوو.

ئەو شەوە حەزرەتی یوسفی لە خەونیدا بینی. حەزرەتی یوسف ماچی ناوچەوانی ئەوی دەکرد و پێی دەوت:

- رۆڵەکەم! پیرۆزباییت لێ دەکەم! مژدەت لێبێت، لە بەهەشتدا دەبیت بە دراوسێی من.

# پەیامەکەم وەرگرت،
# ئەی پەروەردگار!

بازرگانێکی دەوڵەمەند بوو. باوەڕدار بوو. لە بارەی کاری خێر و چاکەوە زۆر هەستیار بوو. تا لە توانایدا بووایە دەستی نەدەگێڕایەوە لە سەرفکردنی قازانجەکەی بە ئاڕاستەی خێردا. باوەڕی بەوە هەبوو کە ئەمە لە هەموو خراپەیەك دەیپارێزێت.

پەیوەندیی بازرگانی لەگەڵ ڕوسیادا هەبوو. لەبەر ئەوە زوو زوو سەردانی ڕوسیای دەکرد. ڕۆژێکیان دیسان لەگەڵ هاوڕێکانیدا چووبوونە ڕوسیا. نانی ئێوارەیان لەو ئوتێلە دەخوارد کە لێی دەمانەوە.

کە چووە خوارەوە بۆ لۆبییەکە، ئافرەتی زۆر جوانی لەو ناوەدا بینی. وەك پیاوێك، زۆر سەخت بوو نەکەوێتە ژێر کاریگەرییانەوە. ئەم ئافرەتانە کارمەندی ئوتێلەکە بوون و پێویستیی میوانەکانیان جێبەجێ دەکرد. هاوڕێکەی هاتە لایەوە و وتی:

- شێرەکەم وا بزانم ئێمە بۆ بەهەشت هاتووین، سەیرێکی ئەوانە بکە.

ئەم قسانەی هاوڕێکەی بە لای ئەویشەوە خۆش بوو. لە ناخەوە دەیوت:

- کورە خۆ چی دەبێت! بەیانی کە هەستام تەوبە دەکەم.

## ئازار بە پەراسووەکانی گەیشت

بڕیاری خۆی دابوو. هاوڕێکانی چوونەوە ژوورەکانی خۆیان. ئەویش بەرەو ژوورەکەی خۆی دەڕۆیشت کاتێك لەناکاو پێی هەڵخلیسکا، سەرسەمێکی دا و کەوت بە زەویدا. ئازار بە پەراسووەکانی گەیشت. ئازارێکی بەسۆ.

بەو ئازارەوە هاتەوە بۆ ژوورەکەی. وەکو ئەوەبوو خەنجەرێك کرابێت بە لای چەپیدا. بەزۆر خۆی خستە سەر جێگاکەی. لەم کاتەدا لە دەرگا درا و یەکێك لەو ژنانە هاتە ژوورەوە. نیازی ژنەکە ئاشکرا بوو.

هەر کە ژنەکەی بینی یەکسەر دەریکرد. لە لایەکەوە لای چەپی دەگرت و لە لایەکی دیکەوە لە ناخەوە دەیوت:

- پەیامەکەم وەرگرت خوایە گیان! هەزاران سوپاس و ستایش بۆ تۆ کە بۆ جارێکی دیکەش منت لە حەرام پاراست!

# بۆچی هەموو پارەی دەرماڵەکەی دایە دەست هەژارەکە؟

دۆستێکی ئازیزی دیکەم دەیگێڕێتەوە:

لە "ئیزمیر" بازرگانێکم دەناسی کە زۆر حەزی بە کاری خێرخوازی دەکرد. بە ماڵ و سامانەکەیەوە یەکێك بوو لەوانەی کە پێشەنگ بوون. لە کردنەوەی یەکەمین بەشەناوخۆیی ئیزمیردا هاوکارییەکی بەرچاوی پێشکەشکردبوو.

ڕۆژێکیان هات بۆ لام. چاوەکانی پڕ بوون لە ئاو. دەیویست شتێکم لەگەڵدا باس بکات. بەڵام چەندی دەکرد نەیدەتوانی بچێتە سەر باسەکە. هەستی زۆر بزوابوو. پاش کەمێك دەستی کرد بە باسکردنی:

مامۆستا ئەو ڕۆژە بیرۆکەیەکی لەم جۆرە بە مێشکمدا هات: ئەو قوتابییانەی لە بەشە ناوخۆییەکە دەمێننەوە، ئێمە ئاگامان لێیانە، هەموو پێداویستییەکی ماددی و مەعنەویمان بۆ دابینکردوون. لەنێو بەشە ناوخۆییدا تا بڵێیت باشن. وتم با لە یەکێکیانەوە تەماشا بکەم بزانم کە لە بەشەناوخۆیی دەردەچن و دەچنە بازاڕ چی دەکەن، بۆ کوێ دەڕۆن.

لەبەردەم بەشەناوخۆییەکەیاندا لە پەناگەیەکدا خۆم پەنادا. خوێندکارێك لە بەشەناوخۆییەکەوە بە جانتاکەی دەستیەوە لە دەرگاکە هاتە دەرەوە. ئەستەم بوو من ببینێت. دوای کەوتم. ڕێگای قوتابخانەی گرتبووە بەر. لە ناخەوە وتم "سوپاس بۆ تۆ خوایە گیان، ڕەنجمان بە زایە نەچووە. ئەم قوتابییە لاوە بە ڕێگایەکی هەڵەدا و بۆ شوێنێکی هەڵە ناچێت."

ئیدی بەتەواوی لە قوتابخانەکە نزیکبووبووەوە. منیش بڕیارمدا بگەڕێمەوە. خەریکبوو دەگەڕامەوە، وتم با بۆ دواجار سەیرێکی کوڕەکە بکەم. چی ببینم باشە. لەسەر ڕێگاکە سواڵکەرێکی لێبوو. بە حاڵیدا دیاربوو زۆر نەدارە. بۆ کوڕەش نەچێت هەموو پارە لولکراوەکانی ناو گیرفانی بداتە دەست سواڵکەرەکە!

زۆرم پێناخۆش بوو. ئەو پارەیەی کوڕەکە دای بە هەژارەکە، هەموو ئەو پارەیە بوو کە ئێمە وەك دەرماڵەی خوێندن دەیاندەینێ. ئەو قوتابییە دەرماڵەی مانگێکی تەواوی خۆیی دایە دەست ئەو سواڵکەرە. لە دڵی خۆمدا وتم "دەبێت لێپرسینەوەی ئەمەی لەگەڵدا بکەم." چونکە ئەو پارانە هەر وا ئاسان بەدەست نەدەهات.

## کوڕم بۆچی هەموو خەرجیەکەی خۆتت پێدا؟

نزیك کاتی گەڕانەوەی کوڕەکە هاتمەوە بۆ بەشی ناوخۆیی و پێم وت:

"کوڕم ئەم بەیانییە تۆم بینی خەرجییەکەی خۆتت دایە دەست سواڵکەرێکی سەر ڕێگاکە. ئاخر ئەوەندە پارە دەدرێت بە سواڵکەر؟ بڕێك پارەی وردەت پێدابا. تۆ تەواوی دەرماڵەکەتت دایە ئەو. ئێستا بە درێژایی مانگێك چی دەکەیت؟ ئەوەی کە کردت شتێکی ڕاست نییە."

کە من ئەمانەم وت لەناکاو ڕوخساری کوڕەکە لە شەرمدا سوور هەڵگەڕا. زۆر شەرمەزاربووبوو. لە خۆم تووڕەبووم و وتم "تۆ بڵێیت زۆر بەتوندی قسەم کردبێت؟" بەڵام چاوەڕێی ڕوونکردنەوەیەکیشم لە کوڕەکە دەکرد.

بە شێوازێکی شەرمنانە و خەجاڵەتییەوە ئەمانەی بە من وت:

"مامۆستا بەیانی کە لە ڕێگادا دەڕۆیشتم. گوناهێکم ئەنجامدا کە خوا قەدەغەی کردووە. چاوم چووە سەر حەرامێك. پێغەمبەری سەروەریشمان داوامان لێ دەکات کاتێك گوناهێك ئەنجام دەدەین لەبری ئەوەدا چاکەیەك بکەین کە زۆر لەسەر دڵ و دەروونمان قورس بێت و دوابەدوای ئەوەش بە دڵ و گیان تەوبە و ئیستیغفار بکەین. ئەمڕۆ لە گیرفانمدا ئەو خەرجییەم هەبوو کە دڵم پێی خۆش بوو و، گرنگ بوو بۆم. لەبەر ئەوە هەموویم دایە دەست هەژارەکە."

لەوە زیاتر خۆی بۆ نەگیرا و دایە قوڵپی گریان.

دوای ئەم ڕوونکردنەوەیە وەك بە گوللە لە مێشکمیان دابێت وەها بووم. تاکە شت لە دەستم بهاتایە، بەشداریکردنی هەنسکەکانی ئەو بوو. منیش هەر وام کرد.

## نابێت دڵ بە ژەنگی گوناه پیس بکرێت!

ئەوەی بازرگانەکە بۆی گێڕامەوە هەستی منیشی بزواند. منیش ئەمانەم پێ وت:

- دڵ، ماڵی خوایە. ئەو دڵەی کە ماڵی خوایە، پێویستە بە گوێرەی بەهای میوانەکەی پاك و خاوێن و، ڕێکوپێك و ڕازاوە بێت تا میوانەکەی خۆشنوود

بکات. پەروەردگارمان دەفەرموێت ”من لە گەردووندا جێم نابێتەوە. بەڵام لە دڵی بەندە باوەڕدارەکانمدا جێم دەبێتەوە.“ پەروەردگارمان بە میهرەبانییەکەیەوە دەبێتە میوانی دڵمان. مادەم دڵ ماڵی خوایە، کەواتە نابێت ئەوێ بە ژەنگی گوناهـ پیس بکرێت.

لەبەر ئەوەیە کە گەورەکانمان دەڵێن نابێت ماوە بە گوناهـ بدرێت. پێویستە هیچ گوناهێك بە بچووك نەبینرێت. گەر هێندەی گەردێکیش بێت، لە هەموو گوناهێکدا ڕێگایەك هەیە بەرەو کوفر. ئەو گوناهانەی وەك بچووك دەردەکەون توانای ئەوەیان هەیە بەپێی زەمەن مرۆڤ بەرەو گوناهە گەورەکان کێش بکەن.

خوا کە دەفەرموێت ”ئەوەی مافت نەبێت نابێت تەماشای بکەیت.“ سنوورێك بۆ چاو دادەنێت. ئەوانەی ڕوانین بە بچووك دەزانن مەترسی ئەوەیان هەیە بکەونە داو و تەڵەی گەورەترەوە. پاك ڕاگرتنی دڵەکانمان پەیوەستە بەو هەستیارییەوە کە لەبەرامبەر گوناهەکاندا هەمانە.

داوامان وایە پەروەردگارمان هەستی هەستیاریی پێویست لەبەرامبەر حەرامەکاندا بکاتە بەشی هەموو لایەکمان.

## دڵمان بپارێزە لە ئارەزووی گوناهەکان!

ئێمەیش با خاڵی کۆتایی پەرتوکەکەمان بە نزایەك دابنێین:

''خوایە! چاو و دڵ و دەروون و مێشك و دەست و کەمەر و پێ و زمان و گوێم لە حەرام و مەیلی حەرام و ئاڕاستەی حەرام بپارێزە! چاوەکانم لە ناپاکی و، دەستم لە گوناهـ و، زمانم لە گوفتاری خراپ و، دڵم لە مەیلی حەرام و، ناخم لە ئارەزووی گوناهـ و، عەقڵم لە گومڕایی و، نەفسم لە یاخیبوون و هاوەڵبڕیاردان و کوفر بپارێزە! ئێمە بە بەندەی خۆت قەبووڵ بفەرموو! لە گوناهەکانمان ببورە! بە ڕێژنەی بەزەییت دامانپۆشە! هێز و توانا بدە بە مێشك و بیر و هۆشمان! چێژی ئیمان لە دڵماندا زیاد بکە! لە دونیا و دواڕۆژدا ڕێنوێنیمان بکە! لە ڕێگای ڕاست و دروست لامان مەدە!

لە خراپەی حەرامەکان و، ڕوخساری ناشیرینی گوناهەکان و، وەسوەسەی شومی شەیتان و، هەستە نابیناکانی نەفسمان و، دۆخی پیلانگێڕیی هزری خراپەویستمان و، دڕندەیی هێزی تووڕەییمان و، مەترسییەکانی هێزی شەهوەت، هەموو لایەکمان بپارێزە!''

ئامین... ئامین... ئامین...

پاکیزەیی واتە ژیان لەنێو چوارچێوەی ڕێپێدراودا. گوزارشتە لە دەستنەبردن و هەنگاونەنان بۆ کێڵگەی ڕێپێنەدراو.

مرۆڤی خاوەن عیففەت و پاکیزەیی چاو و گوێ و دەست و قاچ و هەموو ئەندامەکانی جەستەی لە چوارچێوەی ڕێپێدراودا بەکاردێنێت و بە هیچ جۆرێك و بە هیچ ڕێگایەك ڕێپێنەدراو و حەرام ئەنجام نادات و هەردەم لەو دۆخانە بەدوور دەبێت کە شکۆ و ئابڕووی دەڕووشێنن.

ئەم پەرتووکەی بەردەستتان لە بابەتی پاکیزەیی دەدوێت کە یەکێکە لە گەورەترین تاقیکردنەوەکانی ئەوەی ئەمڕۆمان و وەك سەروەریشمان دەفەرموێت؛ یەکێکە لە خەتەرناکترین هۆکارەکانی هەڵخلیسکانی ئیمانداران. لەم بابەتەشدا چەندین نموونە و بەسەرهاتی دوێنێ و ئەمڕۆمان دەخاتە ڕوو:

شەیتان چۆن بەرسیسای لەخشتە برد؟

لە خوا بترسە، دەست بۆ پاکیزەییم درێژ مەکە!

پێت خۆشە هەمان شت لەگەڵ خوشکەکەتدا ئەنجام بدرێت؟

چل ڕۆژ ئەشکی پەشیمانی لەپای یەك نیگای حەرام.

هەستیاری حەزرەتی عائیشەی دایکمان لەمەڕ داپۆشراوی.

ئەبو مەرسەد چۆن خۆی لە زینا پاراست؟

براکەم، تۆ هەر بەڕاستی نموونەی پاکیزەییت!

گرنگ ئەوەیە بتوانیت لە ناو شاردا خۆپارێز بیت!

دایە گەورە، ئەمانتوانی "هەدیە"کەت بپارێزین، گەردنمان ئازادبکە!

کردنەوەی پێگە ئەشیاوەکانی ئینتەرنێتم کردبووە خوو.

ئاه لەدەست گفتوگۆی پیاوان لەبارەی هاوسەری دووەمەوە!

تکایە یارمەتیم بدەن، نامەوێت ناموسم لەکەدار ببێت!

بەنرخترین دارایی خانمێك پاکیزەییەتی، کچەکەم!

بۆچی هەموو پارەی دەرماڵەی دایە دەست هەژارەکە؟

IRFAN PUBLISHING

9 649750 001090

İffet Yahu

نرخی ٤٠٠٠ دینارە